
قەحپەی
١٣٥
چاپی دووەم
کیلۆیی
نووسینی چارلس بۆکۆفسکی
وەرگێڕانی شۆڕش غەفووری


لە بڵاوکراوەکانی (ماڵی وەفایی)



**کتێب:** قەحپەی ١٣٥ کیلۆیی/ چیرۆک

**نووسەر:** چارلس بۆکۆفسکی

**کردنە کوردی:** شۆڕش غەفووری

**دیزانی بەرگ و نەخشەسازی ناوەوە:** شۆڕش غەفووری

**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

**نۆرەی چاپ:** چاپی دووەم

**ژمارەی سپاردن:** ١٣٣ی ساڵی ٢٠١٣ی زایینی بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

**شوێنی چاپ:** تاران/ تێران

ماڵی وەفایی ـ هەولێر/٢٠١٧

**ناونیشان:** هەولێر ـ فلکەی زراعە

**ژمارە مۆبایل:** ٠٧٥٠٤٨٢٦٦٤٧

**فەیسبووک:** mali.wafai

| لاپەڕە | پێرست |
| --- | --- |
| ٥ | پێشەرکی |
| ٧ | ژیان و بەرهەمەکانی بۆکۆفسکی |
| ١٢ | گفتوگۆی یەکەم/ قسەی پیرەپیاوێکی سووک و چرووک |
| ٤٥ | گفتوگۆی دووەم/ وەرگیراو لە یادداشتەکانی بۆک |
| ٥٤ | بەرهەمەکانی بۆکۆفسکی |
| ٥٥ | ناساندنی بەرهەمەکانی بۆکۆفسکی |
| ٦١ | چەند چیرۆکی بۆکۆفسکی |
| ٦٢ | دێو |
| ٧٥ | قەحپەی ١٣٥ کیلۆیی |
| ٨٥ | خۆکوژی |
| ١٠٧ | بێگۆرەویی |
| ١٢٥ | هەزار پیشە |
| ١٣٤ | شاری خراپ |
| ١٤٤ | ئەلف |
| ١٥٣ | یەک دۆلار و بیست سەنت |
| ١٦٠ | خۆشەویستیتم پێ ببەخشە |
| ١٧٣ | ئەلبوومی بۆکۆفسکی |

## پێشەکی:

مـن زۆر جـاران بـە خوێندنـەوەی کتێبێـك، حـاڵ و هەواییەکـی تایبـەت دامدەگرێـت و چەندیـن ڕۆژ دەمخاتـە نێـو فـەزا تایبەتییەکـی خۆیـەوە.

بـڕوا بکـەن، بـە خوێندنـەوەی ئـەو دوو گفتوگـۆ و چەنـد کورتـە چیرۆکـەی (چارلـس بۆکۆفسکی)ـی شـاعیر و چیرۆکنـووس و هەلەقوبەلەقبێـژ، نەمتوانـی هەسـت بـە نێزیکـی نێـوان ئـەو و خـۆم نەکـەم.

هـەر بۆیەیشـە کتێبەکـەم پێشـکەش بـەو هـاوڕێ کۆنانـەی خـۆم کـردووە کـە ئـەوان زیاتـر لەگەڵـم ژیـاون و هەسـت بـەو نێزیکـی و لێکچوونـەم لەگـەڵ بۆکۆفسـکی دەکـەن. ژیـان لای بۆکۆفسـکی دەرخسـتنیەتی بـە شـێوەیەکی واقعبینانـە، بـەڵام لـە کاتـی مەسـتیدا.

مـن کـە سـەیری وێنـە و تایبەتمەندییەکانـی ئـەم نووسـەرە ئەمەریکییـە دەکـەم، هەسـت بـەوە دەکـەم دنیـا چەنـدە خەڵکـی گەمـژەی تێدایـە، چەنـدە ئەوانـە گەمـژەن کـە پیاوێکـی سەرخۆشـی پیسـی سەروشـپرێوی قـژ ئاڵـۆزکاوی خوومـار دەبینـن و بێزیـان لـێ دەبێتـەوە و نەفرەتـی لـێ دەکـەن، لـە کاتێکدا لـەوە تێناگـەن کـە ئـەوە ئەوانـن دەبێـت نەفرەتیـان لـێ بکرێـت، چونکـە کـێ دەزانێـت ئـەوەی لـەو فـۆڕم و شـێوازەدا دەردەکەوێـت بۆکۆفسـکیەکی دیکـە نەبێـت.

هەرچۆنێـك بێـت، ئەمـە سـەرەتایەکی باشـە بـۆ ناسـاندنی شـێوازی نووسـین و ناسـاندنێکی تیشکئاسـای ئـەم پیـاوە مەزنـە بـە خوێنەرانـی کـورد کـە تـا ئێسـتا نـاوی بۆکۆفسـکیان نەبیسـتووە. هیـوادارم بتوانـم ئـەو کتێبانـەی بۆکۆفسـکی کـە بـە زەحمـەت چنگـم کەوتـوون، وەریانبگێـڕم کـە لـە هەنووکـەوە کردوومنەتـە پـڕۆژەی داهاتـووم.



ڕۆژێک دێتە پێشەوە کە مرۆڤ خۆی دەکوژێت، بەڵام نەک ئەوەی مووسێک هەڵگرێت و ڕەگی دەستی ببڕێت..

نا!

بەڵکو ئیحساسی لەبیر دەکات.

بۆکۆفسکی

## ژیان و بەرهەمەکانی چارلس بۆکۆفسکی:

(هێنری چارلز بۆکۆفسکی ـ Charles Bukowski) شاعیر و چیرۆکنووسێکی لۆس ئەنجلێسە کە نووسینەکانی تەواو لە ژێر کاریگەری فەزای ئەو شارەن. ئەو زۆربەی جار وەك نووسەرێکی کاریگەریی هاوچەرخ ناودەبرێت و مێتۆدەکانی نووسینی چەندین جار لاسایی کراونەتەوە.

نووسەرێکی سەرقاڵە..

هەزاران شیعر، سەدان کورتە چیرۆك، شەش ڕۆمان و زیاتر لە پەنجا کتێبی نووسیوە. بۆکۆفسکی، لە (١٦ی ئابی ساڵی ١٩٢٠)ی زایینی لە شاری (ئاندرناخ)ـی ئەڵمانیا لە بنەماڵەی (هێنری کارۆڵ بۆکۆفسکی) لە دایك بووە. (کاترینا فێت)ـی دایکی بە ڕەچەڵەك ئەڵمانی بوو و باوکیشی کە ئەڵمانی ـ ئەمەریکایی بوو، پاش شەڕی جیهانی یەکەم چاویان بە یەکتری دەکەوێت. باوانی بۆکۆفسکی لە ئەڵمانیا لەدایك بوونە. بۆکۆفسکی هەردەم بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە زۆڵە، بەڵام بەڵگەکانی ئاندرناخ ئەوە نیشان دەدەن کە دایك و باوکی، مانگێك بەر لە لەدایکبوونی، بە فەرمی هاوسەرگیریيان کردووە. پاش

خراپبوونـی بارودۆخـی ئابـووری ئەڵمانیـا لـە کاتـی شـەڕ جیهانی یەکـەم، بنەماڵەکـەی لـە سـاڵ (١٩٢٣) دەچنـە بالتیمـۆر.
دایك و باوکی لە زمانـی ئەمەریکیـدا بـە (هێـنری) بانگیـان دەکرد و نازنـاوی بنەماڵەکەیـان لـە (Buk-ov-ski) بـۆ (Buk-cow-ski) گۆڕی.
پـاش پاشـەکەوتی بـڕە پارەیـەك، بنەماڵەکەیـان گواسـتیانەوە بـۆ دەوروبـەری لـۆس ئەنجلێـس، شـوێنێك کـە بنەماڵـەی باوکـی بۆکۆفسـکی لـەوێ دەژیـان. لـە سـەردەمی منداڵیـدا، زۆربـەی کاتـەکان باوکی بێئیش بـوو و بـە بـڕوای بۆکۆفسـکی زمان پیس و تـووڕە و تۆسـنیش بـوو.
پـاش دەرچوونـی لـە قۆناغـی ئامادەیـی، بۆکۆفسـکی دوو سـاڵ لـە زانکـۆی شـاری لـۆس ئەنجلێـس دەخوێنێـت و خووڵەکانـی هونـەر، ڕۆژنامەنووسـی و ئەدەبیـات دەبینێـت، چونکـە حەزێکـی زۆری بـۆ نووسـین هەبـوو.
لـە تەمەنـی (٢٤) سـاڵیدا، کورتەچیرۆکـی (ئاکامـی یادداشـتێکی درێـژی دەرنەچـوو)ی لـە گۆڤـاری (چیـرۆك) چـاپ بـوو و کاتێـك باوکـی چیرۆکەکـە دەخوێنێتـەوە، هەمـوو دەستنووسـەکانی فـڕێ دەداتـە دەرەوە و لـەوە بـەدواوە چارلسـیش ماڵـی باوکـی بەجـێ دەهێڵێـت و ژوورێك لـە یەکێـك لـە گەڕەکـە هەژارنشـینەکانی لـۆس ئەنجلێـس بەکـرێ دەگرێـت.
سـاڵی (١٩٤٤)، کـە شـەڕی دووەمـی جیهانی هێشـتا درێـژەی هەبوو، (FBI) بـە تاوانـی خۆدزینـەوە لـە خزمەتـی سـەربازی دەیگـرن. پـاش (١٧) ڕۆژ زیندانـی و ملـدان بـۆ تاقیکردنەوەیەکـی دەروونـی، لـە خزمەتـی سـەربازی ڕزگاری دەبێـت. دوو سـاڵ دواتـر، کورتـە چیرۆکـی (٢٠ سـوپاس لـە کاسڵدان)ـی چـاپ بـوو. بۆکۆفسـکی بـۆ نێزیکـەی دە سـاڵێك وازی لـە چیرۆکنووسـین و چیرۆکچاپکـردن هێنـا و ئـەو ماوەیـەی لـە لـۆس ئەنجلێـس بەسـەر بـرد، بـەڵام ماوەیەکیش لـە ویلایەتـە یەکگرتـووەکانی ئەمەریـکا سـەرگەردان دەبێـت و کاری جیـا جیـا دەکات و لـە ژووره هەرزانباوییەکانـدا دەمێنێتـەوە.
بۆکۆفسـکی لـە سـەرەتای سـاڵانی (١٩٥٠)ی زایینـی لـە بەڕێوەبەرایەتـی پۆسـتەی لـۆس ئەنجلێـس دەسـتی کـردە کاری

پۆستەچییەتی و نامەگەیاندن، بەڵام دوای دوو ساڵ و نیو وازی لێ هێنا. لە ساڵی (١٩٥٥) و بە هۆی برینە قووڵەکەی گەدەیەوە کەوتە نەخۆشخانە. کاتێک کە لە نەخۆشخانە دەرچوو دەستی کردە نووسینی شیعر. لە ساڵی (١٩٥٧) لەگەڵ (باربار فێری)ـی شاعیر و نووسەر زەماوەندیان کرد، بەڵام لە ساڵی (١٩٥٩) لە یەکتری جیا بوونەوە.

فێری، پێداگری لەسەر ئەوە دەکردەوە کە جیابوونەوەیان هیچ پەیوەندییەکی بە ئەدەبیاتەوە نییە، ئەگەرچی زۆربەی جاران بە شێوەی گوماناوی دەیگوت توانای بۆکۆفسکی لە شیعردا بەهێزە. پاش ئەم جیابوونەوەیە، بۆکۆفسکی دووبارە دەستی کردەوە بە شەرابخواردنەوە و بەردەوامیش بوو لە شیعرنووسین. پاشان گەڕایەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆستە، ئەو شوێنەی کە دە ساڵ پێشتر کاری تێدا دەکرد. لە ساڵی (١٩٦٤)، کچێک بە ناوی (مارینا لویس بۆکۆفسکی) لە ئەو و (فرانس ئیسمەیت) لەدایک بوو. ئیسمەیت و بۆکۆفسکی پێکەوە دەژیان، بەڵام هیچ کات بە فەرمی نەبوونە ژن و مێرد. بۆکۆفسکی، بۆ ماوەیەکی کورت لە (تۆزان) نیشتەجێ بوو، ئەو شوێنەی کە (جان و جیپسی لۆ وێب)ـی هاوڕێی لێی بوو. وێبزیەکان گۆڤارێکی ئەدەبییان بە ناوی (The Outsider) دەرکرد و وەك فایل و بە شێوەی تایبەت هەندێك لە شیعرەکانی بۆکۆفسکییان چاپ کرد. ئەوان (دڵی من لە دەستی تۆ دەستبەسەرە ـ ١٩٦٣) و (خاچ لە مەرگدا ـ ١٩٦٥)یان لە بۆکۆفسکی چاپ کرد.

جان وێب، تێچووی چاپەکەی لە قومارکردن لە لاسڤێگاس دەست کەوت. هەر بەم شێوەیە بوو کە هاوڕێیەتی بۆکۆفسکی و فرانس داسکی، دەستی پێ کرد. ئەوان گفتوگۆیان دەکرد و زۆر جاریش دەیکێشایە سەر کوتان و لێدان. داسکی یەکێك لە هاوڕێکانی وێب بوو کە زۆرجاران لە ماڵە چکۆڵەکەیان لە شەقامی (E. Elm) میوان بوو و بە کارەکانی چاپ ڕادەگەیشت. وێبزیەکان، بۆکۆفسکی و داسکی ماوەیەك پێکەوە لە (New Orleans) بوون، شوێنێك کە (جیپسی لۆ) پاش مردنی جان وێب گەڕایەوە بۆی.

لە ساڵی (١٩٦٩)، پاش بەستنی ڕێککەوتننامە لەگەڵ دەزگای چاپی (Black Sparrow Press) و چاپەرەکەی واتە (جان مارتین) و برینەوەی مافی هەتاهەتایی مانگانەی (١٠٠) دۆلاری ئەمەریکی، وازی لە کارەکەی لە بەڕێوەبەرایەتی پۆستە هێنا و دەستی کردە نووسینی بەردەوام. ئەوکات بۆکۆفسکی (٤٩) ساڵان بوو.
هەروەك چۆن لە نامەیەکیدا سەبارەت بەو کات دەڵێت:
«من دوو هەڵبژاردنم هەبوو. لە بەڕێوەبەرایەتی پۆستە بمێنمەوە و گەمژە بم یا لە دەرەوەی ئەو بەڕێوەبەرایەتییە بم و وەها نیشان بدەم کە نووسەرم و هەمیشە برسی بم. من بڕیارم دا کە برسی بم.»
کەمتر لە یەك هەیڤ پاش وازهێنان لە بەڕێوەبەرایەتی پۆستە، یەکەم ڕۆمانی خۆی بە ناوی (پۆستەخانە) تەواو کرد. بۆکۆفسکی ڕێزێکی زۆری بۆ پاڵپشتییەکان ماڵی مارتین هەبوو، چونکە وەك نووسەرێکی نەناسراو بڕوایان پێ کردبوو، هەر بۆیە زۆربەی کارەکانی بۆ چاپ دەجایە دەزگای چاپی (Black Sparrow). لە ساڵی (١٩٧٦)، چاوی بە (لیندا لی پێلی) دەکەوێت کە خاوەنی خواردنگەی(health food) بوو و دوو ساڵ دواتر و لە ڕۆژهەڵاتی هالیود، شوێنێك کە بۆکۆفسکی زیاتر لە هەموو شوێنەکانی دیکە تیایدا ژیا، بەندەری (سێن پێدرۆ) و ناوچەکانی دیکەی باشووری شاری لۆس ئەنجلێس بوون. بۆکۆفسکی و پێلی لە ساڵی (١٩٨٥) زەماوەندیان کرد. (لیندا لی پێلی) لە ڕۆمانەکانی (ژنان و هالیۆد) بە ناوی (سارا) ناوی لێنراوە.
بۆکۆفسکی لە (٩ی مارسی ساڵی ١٩٩٤) لە (سێن پێدرۆ)ی کالیفۆرنیا و لە تەمەنی (٧٣) ساڵیدا، واتە کەمێك پاش تەواوکردنی دواهەمین ڕۆمانی بە ناوی (خڵتە) لە نەخۆشخانە و بە هۆی نەخۆشی شێرپەنجەی خوێنەوە کۆچی دوایی کرد. ڕێوڕەسمی ناشتنەکەی بە هۆی ڕاهیبە بوودایيەکانەوە ئەنجام درا. لەسەر کێلە قەبرەکەی ئەم ڕستەیە نووسراوە:

(!Don›t Try - هەوڵ مەدە)

بە قسەی (لیندا بۆکۆفسکی)، مەبەستی مێردەکەی لەم نووسراوەیەی سەر کێلەکەی ئەمەیە:
«ئەگەر ئێوە هەموو کاتی خۆتان بۆ هەوڵدان بەکار ببەن، ئەوکاتە هەموو ئەو شتەی کە ئەنجامتان داوە، هەوڵدان بووە. کەوایە هەوڵ مەدەن. تەنیا ئەنجامی بدەن.»

سەرچاوە: Wikipedia

# قسەی پیرەپیاوێکی سووک و چرووک

(سێلڤیا بیزیۆ - Silvia Bizio) ساڵی ١٩٨١

(چارلز بۆکۆفسکی) دەزانێت لە بارەی چییەوە دەنووسێت. بۆکۆفسکی پیاوێکی گۆشەگیر، مەشرووبخۆرێکی لێهاتوو و یەکێکە لە دانیشتوانی شەوە گێرەشێوێنییەکانی لۆس ئەنجلێس. ئەزموونەکانی خۆی بە نووسینی زیاتر لە (٣٠) کتێب - هەر لە ئەتۆبیوگرافیك و شیعر و نۆڤڵێتەوە بگرە تا ڕۆمان - بەکار بردووە. کتێبگەلێك کە گۆرانی دەچڕن. ئەو، خاوەنی ڕاڕاییە گەڕۆکییەکەی کێرواك(٢)، بێباکییە ئیرۆتیزییەکەی میلەر و هەوەسبازی قابیلە.

بۆکۆفسکی زۆر درەنگ دەستی بە نووسین کرد.

پاش (١٤) ساڵ قەناعەت و کارکردن لە بەڕێوەبەرایەتی پۆستە و یەك دوو ساڵێکیش زیندان و نەخۆشخانە، بەڵام ئەوڕۆکە لە تەمەنی (٦١) ساڵیدا، شەرەفی ددانپیانان و خوێندنەوەی لە لایەن خەڵکەوە پێ دراوە. چیرۆکەکانی، کراونەتە فیلم و لە هەموو ئەورووپادا بە قارەمانێکی فەرهەنگی نێوبانگی دەرکردووە. لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، (١٠٠) هەزار دانە لە دواهەمین ڕۆمانەکەی واتە ڕۆمانی (ژنەکان) فرۆشراوە.

بۆکۆفسکی ڕۆژانە بۆ کوێ دەچێت؟ وەك (هانك چیناسکی) - دژەقارەمانی چیرۆکەکانی - ڕۆژانە دەچێتە نێو گۆڕەپانی ئەسپسوارییەوە و شەوانەیش بەدەم گوێگرتنی موزیکی کلاسیکی نێو ڕادیۆ و خواردنەوەی ئاوی سووری ترێی نێو بتڵ، دەنووسێت.

نهۆ، بۆکۆفسکی خەریکی نووسینی ڕۆمانێکە (٣) لە بارەی سەردەمی منداڵییەوە. (سێلڤیا بیزیۆ)ی ڕۆژنامەنووسی ئیتالیایی لە ماڵەکەی بۆکۆفسکی لە (سێن پێدرۆ)، لە کاتی خولی نۆیەمی کێبەرکێی ئەسپسواری و پاش خواردنەوەی پێنج بتڵە شەراب، ئەم دیدارەی لەگەڵ ساز دا.

**هـای تایمـز: بابەتەکانـت لـە ئەورووپـادا زیاتـرە دەخوێنرێنـەوە، تـۆ چ دەڵـەی؟**

بۆکۆفسـکی: ئەوروپـا لـە شـیعر، نیگارکێشـان و هونـەردا سـەد سـاڵێك لـە پێشـەوەی ئێمەیـە کـە ئەمەیـش جێگـەی بەختـەوەری منـە. لێـرە زۆر ئافەریـن بـە کارەکـەم ناگوترێـت. بـە تایبەتی فیمینیسـتەکان کـە زۆر ڕقیان لـە مـن دەبێتـەوە، چونکە هەمـوو ئـەو شـتانەی دەیاننووسـم نایخوێننەوە، بەڵکو بەشـێکی لـێ دەخوێننـەوە. ئـەوان هێنـدە هەڵدەچـن کـە ناتوانـن پـاش خوێندنـەوەی لاپەڕەیـەك یـا چیرۆکێـك درێـژە بـە خوێندنـەوە بـدەن. ئەمـە کێشـەی مـن نییـە، بەڵکـو کێشـەی ئەوانـە. ئـەوان بـەر لـەوەی مـن هەمـوو ئـەو زبـڵ و قسـە بەلاشـانەی کـە دەیاننووسـم بخوێننـەوە، هێرشـم دەکەنـە سـەر.

**هـای تایمـز: تەنیـا ئـەوان نیـن. وا پێدەچێـت کـە بـە گشـتی چـەپ جەماعەتیـش زۆرت لەگـەڵ** لاچەپـن.

بۆکۆفسـکی: چەپـەکان منیـان خـۆش ناوێـت؟! مـن خـۆم کرێـکارم یـا باشـترە وا بڵێـم کـە ماوەیـەك کرێکاریـم کـردووە.

**هـای تایمـز: دەی، تـا ئـەو جێیـەی کـە لـە چەپەکانـی ئەمەریکام بیسـتووە، وەها بـووە؟**

بۆکۆفسـکی: ئەهـاااا لـە ئەمەریـکا؟ مـن خۆشـم لـە چەپـی ئەمەریـکا نایـەت، چونکـە ئـەوان تەنیـا گەمـژەی زگتێـری (وێسـت وود)ن کـە بـە دوای دروشـمدانەوەن. ئـەوان زیاتـر بـە دوای کار و (مـاری جوانـا) یـا بـە دوای تایـەوەن بـۆ ئۆتۆمبێلەکانیـان و هەروەهـا وەدووی کۆکاییـن و چوونە دیسـکۆوەن. وابزانـم لێـرەدا بزووتنـەوەی ڕادیکاڵـی ژێرزەوینـی هەبێـت. هەمـوو شـتێکی ڕادیکاڵـی ژێرزەوینـی، هیـچ نییـە جگـە لـە خـووی بێتـام

و قسـەی لابـەلا و مەبەسـتی ئـەو کەسـانەش کـە دەچنـە نـاوی بـۆ ئەوەیـە سـوودی کاتـی لـێ وەربگـرن. تیپـی هافمێـن (٤) و هەمـوو ئـەو فیڵەبـاز و چەپانـەی ئەمەریـکا، تەنیـا خوویان بـە قسـەی هیچوپووچـی گۆڤارەکانەوە گرتـووە، نـەك وەك وێبلییەکانـی(٥) دەیـەی بیسـتەکان.

چەپـی ئەمەریکایـی، قریـژەی باڵنـدەی دەریاییـە لـە کەسـنەزانەوە، هەمووەدەمیـش هـەر وا بـووە. بەلانـی کەمـەوە دەکرێـت لەگـەڵ وێبلییـەکان قسـە بکرێـت، هەرچەنـدە ناتوانـم لەگەڵیـان هـاوڕا بـم، بـەڵام دەکرێـت پەیکێکیـان لەگەڵـدا لێـك بدەیتـەوە، بـەڵام چـەپ.. بە هیـچ شـێوەیەك لـە خەبـات ناگـەن. شـەڕ لـە شـەقامەکاندایە، مـن لـە شـەقامەکانەوەم، بـەڵام شـەقامیش شـەقامە و کاری زۆری لەگـەڵ ناکرێـت. شـەقامەکان زۆر جوانـن، ڕۆژئـاوای هاڵیـوود زۆر جوانـە، هاڵیـوود و ڕۆژئـاوا، بیـگ سـام، پیـاوی قەحپەخانـە. شـەقامەکان باشـن، پڕ لـە بنیادەم، مرۆڤگەلـی سەیروسـەمەرەن. مـن مرۆڤـە دەوڵەمەندەکانـم کەمتر لـەوەی کـە تـۆ خۆشـت دەوێـن، خۆشـم دەوێـن. ئەگـەر پەنجـا هـەزار دۆلاریشـم بـۆ بکەنـە حیسـابەکەمەوە، دووبـارە خۆشـم ناوێـن. دەشـێت لەگەڵیانـدا خواردنێـك لـە خواردنگەیـەك بخـۆم کـە ڕەنگـە سـەرۆکی چێشـتلێنەرەکەی نـاوی منـی بیسـتبێت، بـەڵام هـەر چۆنێـك بێـت ئەوانـم خـۆش ناوێـت، چونکـە ئـەوان مـردوون.

مـن مرۆڤـە مردووەکانـم خـۆش ناوێـت، تەنانـەت ئەگـەر یـەك ملیـۆن دۆلاریشـیان هەبێـت. سـەروەتەکەیانم قبوڵـە، بـەڵام خۆیـان نـا...

**های تایمز: وابزانم ئەوان مردوونە چونکە پارەیان هەیە؟**

بۆکۆفسـکی: وابزانـم پـارە یارمەتـی مەرگـی ئـەوان دەدات، بـەڵام لـە هەمـان کاتیشـدا هەژارەکانیـش هـەر لەبـەر پـارە دەمـرن. لەدەسـتدانی پـارە، مـرۆڤ تووشـی نەفـەرەت و تووڕەبـوون و هێرشـکردن دەکات. بـا بگەڕێینـەوە سـەر ئـەو هاوکێشـەیەی کـە پەنجـا سـاڵ بـەر لـە ئێسـتا

نووسـیومە: (پـارە تەنیـا لـە دوو کاتـدا قەیـران خوڵقێنـە، زۆرهەبـوون و کەمهەبـوون). تەنانـەت کاتێـك کـە بـە پێـی پێویسـت هەتبێـت دیسـان زۆربـەی کارەکان بـاش ناچنـە پێشـەوە. وەك ئـاو و هـەوا یـا گرۆمۆسـۆم یـا ئـەو کەسـەی کـە لەگەڵیـدا دەژیـن وایـە. هیـچ شـتێك بـۆ هەمیشـە بـە باشـی ڕەوتـار نـاکات و بـاش نییـە.

**های تایمز: لە ڕوانگەی خۆتەوە پیاوێکی ناسیاسیت؟**

بۆکۆفسـکی: هەڵبەتـە! مـن حـەزم لـە هیـچ سیاسـەتێك نییـە، بۆچـی دەبێـت هەمبێـت؟! وەك ئەوەیـە کـە کیسـەی زراوت بـەردی هەبێـت و لـە بـۆ دەرهێنانیشـی دەبێـت پـارە بدەیـت. ئیـتر بۆچـی وەهـا مەیـل و خواسـتێکم هەبێـت.

**هـای تایمـز: دەزانـم کـە حـەزت لـە پرسـیارەیلی سیاسـی نییـە، بـەڵام ئەمەیـان پەیوەنـدی بـە کارەکانتـەوە هەیـە. ئایـا هەڵبژاردنـی (ڕێـگان) بـە گشـتی دەبێتـە هـۆی گـۆڕان لـە دنیـای فەرهەنگـی ئەمەریـکا و لـە پراکتیکیشـدا دەبێتـە هـۆی چاپبوونـی کتێبـی شـیعریی زیاتـری تـۆ؟**

بۆکۆفسـکی: مـن پیاوێکـی سیاسـی نیـم، مەبەسـتم ئەوەیـە کـە ناتوانـم پێشـبینی بکـەم. تەنیـا شـتێك کـە دەتوانـم بیهێنمـە پێـش چـاو و بیڵێـم، ئەوەیـە کـە بارودۆخەکـە کۆسـپدارتر دەبێـت.

زۆرینـەی ئەوانـەی مەسـیحی و موحافیـزەکارن، بەڕێـز ڕێگانیـان هەڵبـژاردووە و ئاساییشـە کـە بەڕێزیان هەوڵـی بەدیهێنانـی ئارەزووەکانیان بـدات، بـەڵام ئەمانـە گریمانـەن. ئـەم بابەتـە نـە کاریگـەری لەسـەر نووسـینی مـن دەبێـت و نـە کاریگەریشـی لەسـەر چاپـی کتێبەکانـم. ناکرێـت زبـڵ و زاڵەکانـم زەق زەق بـە پڕوپـوچ و هـەرزە نـاو بەریـن. خەڵکـی، جـۆرە تووڕەییەکیـان لـە نووسـینەکانم هەیـە و ئـەم نووسـینانە دەبنـە هـۆی ئـەوەی کـە ئـەوان ڕقیـان لـە مـن بێتـەوە. دەزانـم زۆربـەی

شاعیره دەزگاییەکانی ئێره ـ ئەوان دەناسم ـ ڕقیان لە من دەبێتەوە. هەست بە ڕق و تووڕەییەکەیان دەکەم و چێژی لێ وەردەگرم. ئەم هەستە پێم دەڵێت کە خەریکی ئەنجامدانی کارێکم، بەڵام بێگومان ئەگەر هەمووان ڕق و نەفرەتیان لێم هەبوایە، کتێبەکانم نەدەفرۆشران. زۆربەی ئەو کەسانەی کە ڕقیان لە من دەبێتەوە، کتێبەکانم دەکڕن. دەتوانم ئەوە بهێنمە پێش چاوی خۆم کە بەم شێوەیە بیر دەکەنەوە: «زۆر باشە، من زۆرم ڕق لەو کابرایەیە، بەڵام دەمەوێت بزانم نووسینی دواتری چییە.» لە شیعرخوێندنەوەکانیشمدا بارودۆخەکە هەر بەم شێوەیەیە، نیوەی ئەو کەسانەی کە دێنە کۆڕەکانم، ڕقیان لێمە، لە کاتێکدا کە من ئەگەر ڕقم لە کەسێك بێتەوە، ناچمە کۆڕەشیعرییەکانی و خۆمی لێ بە دوور دەگرم. هەمووەم کەسانێك هەن دەیانهەوێت بتکوژن، بە ئۆتۆمبێلەکەیان بتکەن بە ژێرەوە، فەلەجت بکەن، پەنجەکانت ببڕنەوە ـ کەسێك کە بە بیرکردنەوە لە تۆ، خەوی شەوانت حەرام کردووە ـ لە بەرامبەریشدا لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەی سەرەوە، کەسانێکیش هەن کە عاشقتن، تێدەگەی؟! «زۆر باشی بۆکۆفسکی! تۆ ژیانمت ڕزگار کردووە! ئاه بۆکۆفسکی! ئاه بۆکۆفسکی!» و هەر ئەمانەیش حاڵم تێك دەدەن.

**های تایمز: کەواتە ڕقت لەوانە دەبێتەوە کە خۆشیشیان دەوێیت و ئەوانەیشت خۆش دەوێت کە ڕقیان لێت دەبێتەوە؟**

بۆکۆفسکی: نا، بەڵام.. زۆرجار لە کاتی قسەکردندا شتەیلێك دەبێژم کە لە واقیعدا وەها بیر ناکەمەوە. ڕقم لە گوتنی شتگەلێك دەبێتەوە کە موو بە موو و بە تەواوی مەبەستم بگەیەنن، مەگەر بە شێوەیەکی تایبەتی شتێکی گرنگ بێت. هەست ناکەیت گوتنی شتگەلێك کە ڕێك هەمان ئەو واتا و مەبەستەی کە هەتە بیگەیەنێت، بێزارکەر بێت؟ نامەوێت بڵێم: «ئۆی بەڵێ، زۆر باشە، تەواوە.» چونکە وەها زۆر لە

سیاسییەکان دەچم. زۆربەی ئەو شتانەی کە دەیانڵێم لە سەدا سەد مەبەستەکەم نین، بەڵکو تا ڕادەیەك مەبەستەکەم دەپێکن. هەندێك جاریش نووسینەکانم هەر بەم شێوەیەن. کەواتە هەر شتێك کە دەیڵێم، لێکدانەوە و مەبەستی هەنگاو بە هەنگاو و وردی من نییە، چونکە وەها لێکدانەوەیەکیشیان نییە.

**های تایمز: جاری وایە بە نووسینەکانت دەستخەڕۆمان دەکەیت، مەبەست ئەوەیە؟**

بۆکۆفسکی: جاری واشە خۆشم دەستخەڕۆ دەکەم. هەندێك جار نووسینەکانم بۆ دەگەڕێننەوە و دەڵێن: «بۆکۆفسکی ئەمە هەر باش نییە!» و ڕاستیش دەکەن. من زبڵ زۆر دەنووسم. هەندێك کات بە قەستی زبڵ دەنووسم تا خۆم بهێڵمەوە و زۆرێکیش لەوانە باش نین، بەم شێوەیە ڕاهێنان دەکەم، بەڵام زۆرێکیشیان کارگەلی باشن. دەتوانم بڵێم لە (٧٥٪) لەو شتانەی کە دەیاننووسم باشن. (٤٠٪ تا ٤٥٪)ی ئەو ڕێژەیە زۆر باشە و هەروەها لەوەندەیش تەنیا (١٠٪)یان نائەخلاقین. (٢٥٪)ەکەی تریشی زبڵن. ئەرێ بووە (١٠٠٪)؟

**های تایمز: با بگەڕێینەوە بۆ سیاسەت، لەگەڵ ئەوەی کە دەڵەی سیاسی نیم، دووبارە خەڵکی حەز و مەیلێکی سیاسیانە لە نووسینەکانتدا دەبیننەوە؟**

بۆکۆفسکی: ئەوان تەواو هەڵەن. من هیچ پاڵنەرێکی سیاسیم نییە. نە دەمەوێت دنیا ڕزگار بکەم و نە دەشمهەوێت باشتری بکەم. تەنیا شتێك کە من گەرەکمە، ژیانکردنە لەو دونیایەدا و قسەکردنە لەبارەی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی. من نە دەمەوێت ژیانی نەهەنگەکان ڕزگار بکەم و نە ئەوەی کە بۆمبی ناوەکی نەمێنێت. دنیا بە هەر شێوەیەك بێت من لەگەڵیدام. ڕەنگە بڵێم تەنانەت ئەو شتەی کە خۆشیشم

ناوێت، حەزم لێ نییە بیگۆڕم. من زۆر خۆخوازم. هەندێ شتم حەز لێ نییە، وەک ئەوەی کە لە شەقامێکدا ئۆتۆمبێل داژۆم و تایەیەکم پەنچەر دەبێت، ناچار دەبم بێمە خوارەوە و تایە نەفرەتییەکە بگۆڕم یا دەبێت بگەمە گۆڕەپانی ئەسپسواری، ناچارم ڕێگەکەم بگۆڕم و بەرەو لای ڕاستی جادەکە، شوێنی لادانێکیش نییە. هەر بۆیە بەو شێوەیەی کە دەبینی نە هەستێکی قووڵم هەیە و نە جووڵەیەکی جددی. من هیچ خواستێکم نییە. تەنیا دەمەوێت فلچەی ددانەکانم لێدەم تا زوو نەوەرن. هیوام ئەوەیە لە ساڵی داهاتوویشدا بتوانم هەڵبژێرم، تەنیا ئەم شتە بچکۆلانانە. من بە دوای شتی گەورەوە نیم، دەمەوێت بە دوای شتە بچووکەکانەوە بم، وەك بردنەوە لە خوولی سێیەمە ئەسپسواری بە چانسی سێ لەسەر یەك. هەموو خواستەکانم تەنیا لەم ئاستەدان. شتی زۆر جادوویيم ناوێت، نامەوێت پێیەکانم لە بەرەی خۆم زیاتر ڕاکێشم.

**های تایمز: ئەرێ بەڕاست، تۆ زۆر لە فەرمانگەی پۆستە کارت کرد؟**

بۆکۆفسکی: بەڵێ، یانزە ساڵ و نیو شەوانە و دوو ساڵ و نیویش شیفتی ڕۆژانە. من شەوانە نەمدەتوانی بخەوم، هەر لەبەر ئەوە بوو کە دڵم بەوە خۆش دەکرد کە جۆرێکە لە جێژن و پارتی شەوانە. عەسران درەنگ دەستم بە نووسین دەکرد. بە مەستی دەچوومە سەر کارەکەم و کەسەکانی ئەوێ هێندە گێل بوون کە نەیاندەتوانی تێبگەن مەستم یان نا و هاوڕێکەم (ئیسپنێسەر)یش دراگی لێدەدا و دەهات، پاشان هەردووکمان دەچووینە دەرەوە.

بە ئیسپێنسەرم دەگوت:

«دەمەوێت لێرە بڕۆم، چاك دەزانم مەرج لەسەر ئەسپەکان ببەستم!»

دوای پانزە ساڵ هێشتا لە نێو گۆڕەپانەکە دەیبینم. لە نێو کورسییەکان دەیبینم، تەواو تێك شکاوە، نەخۆشە، (بی ئێم دەبلیۆ)کەی من

لەگەڵ (مێرسێدس)ـەکەی خۆی بە هەڵە وەردەگرێت و وادەزانێت من مەرجکردن تێکی داوم. ڕۆژێکیان بانگی کردم و گوتی:
«بیستوومە لە زانکۆکاندا دەسووڕێیتەوە و خەڵکی فریو دەدەی!».
گوتم: «ڕاستە ئیسپێنسەر.»

**های تایمز: ئەو ڕۆژەی پێکەوە بە تەلەفۆن قسەمان کرد، هەستم کرد شەرم دەکەی.**

بۆکۆفسکی: لە ڕاستیدا، لە خەمی (لیندا)دا ـ دڵدارەکەی خۆی ـ بووم. هەر کاتێ قسە لەگەڵ ژنێکدا دەکەم، هەست دەکەم دواتر دەستدرێژی دەکەمە سەری. من زۆر ئاگام لە لیندایە و حەزم لێنییە ببمە هۆی نیگەرانی. هەر لەبەر ئەوەیشە بە تەلەفۆن قسە لەگەڵ ژنێکدا دەکەم شتی وەك «بەڵێ، نا، زۆر باشە» دێتە سەر زمانم. ناڵێم: «خەریکی دێی بۆ گوتوبێژ؟ شەراب دەکڕم، شۆمینەکە (کووره دیواری) دادەگیرسێنم، تەنیاشم، واژۆ.. هەر شتێك بێنی واژۆی دەکەم، بە قەڵەمی گەورە و نەرم، پڕ لە ڕەنگ...»
هەمووده‌م ئاگام لە خۆمە تا بەرامبەرەکەم تێ بگەیەنم کە لەگەڵ کەسێکدا دەژیم و تەنیا نیم.

**های تایمز: ژنی زۆر تەلەفۆنت بۆ دەکەن؟**

بۆکۆفسکی: لە ڕاستیدا ئێستا ئیتر نا. نەهۆ زۆر ئاشکرا نیم. کاتی وەها هەیە ژنەکان دێنە سەردانم، هەموو دێن، بەڵام لە ناکاو بە خۆت دەڵەی هەموو ئەم شتانە ئامادەی دەرکەوتنن لە جەستەدا و ڕووخسار گۆڕانی بەسەردا دێت، بزەکان وشك دەبن و سەرجێیی ماندووکەر دەبێت.
نازانم، دەمەوێت بڵێم (٣١) ڕۆژ پاش لە یەکەم دیدارم، شەیتانێکی بچکۆلە خۆی دەهاوێتە نێوەوە و پێشەکی هەندێ شت دروست

دەكات و بزر دەبێت و تۆیش وادەزانی كە خەریكی خەیاڵ و پلاوی.
ڕاستییەكەی شەش مانگ دواتر دووبارە شەیتانەكە دەگەڕێتەوە و
پەنجەرەكەت دەشكێنێ و بە تاوانی هەڵەی ئەنجام نەدراو، تۆمەتبارت
دەكات. لە ڕوانگەی منەوە ئەمە جۆرێكە لە وزەی تووڕەیی ژنان كە
دەكەوێتە كەوڵمەوە و باشیشە. كاتێك لەگەڵ كەسێك دەژیت، دەبێت
تەحەمولیشی بكەی. دەبێت بەها بۆ چێژە كاتییەكانی ببەخشێت.
دەزانم ئەم شتانە دێنە پێشەوە و هەر جارەی بە خۆم دەڵێم: «ئاە،
نا، ئەم فیلمەم پێشتر بینیوە!» بەڵام دڵنیام كە ژنیش هەمان هەستی
هەیە: «ئاە، نا. ڕاڵفیش هەر بەم شێوەیە بوو، وامدەزانی ئەمەیان
باشترە!»
دواتر دەست دەكەین بە قسەكردن لەبارەی خۆمانەوە و ئەگەر وەسەر
دڵم نەكەوێت، جیا دەبینەوە. سەبارەت بە پەیوەندی مرۆیی، ناتوانم
شتێك بێژم جگە لەوەی كە هەرگیز باش ناچێتە پێشەوە. خەڵكی وا
نیشان دەدەن كە دەچێتە پێشەوە. ئاگربەسی مرۆیی. باشترین شت
كە من لەم بارەوە بیستوومە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كاتەی كە لە
بەڕێوەبەرایەتی پۆستەدا كارم دەكرد و یەكێك دەیگوت پەنجا ساڵ
بەسەر ژنهێنانی تێدەپەڕێت. بەیانی كە لە خەو هەڵدەستا، یەكیان
سەیری ئەوی دیكەیانی دەكرد و بە هێواشییەوە دەیگوت:
«دەی ئێستا دەست بە هیچ مەكە و چی وایش لە گۆڕێدا نییە.»
ئەم باسە سەرەداوی بابەتەكەی پێ دەگەیاندم. ئەوان گوێڕایەڵ بوون.
پەیوەندی مرۆیی ناچێتە پێشەوە، بەڵام ژیانی هاوبەش بەردەوام
دەبێت. لە دەستپێكدا هەموومان دڵفڕێنین. دەكەومەوە بیری یەكێ
لە فیلمەكانی (وودی ئالێن) ـ ئەو لەم جۆرە بابەتانەدا زۆر باش
و شارەزایە ـ ژنەكە دەیگوت: «ئێمە لە ڕۆژانی سەرەتامان ناچین،
ئەوكاتی تۆ زۆر سەرنجڕاكێشتر بووی!»
و ئەو دەیگوت: «دەزانی، ئەوكاتی تەنیا خەریكی جووتبوون بووم،

هەمـوو وزەم بـەکار دەبـرد. ئەگـەر هـەر وەک ئـەوەندەم درێـژەم بـەم کارە دابوایـە، شـێت دەبـووم!، ئەمـە کارێکـە کـە هەمـوووان لـە سـەرەتادا دەیکـەن. لـە سـەرەتای ئاشـنابوونتدا تـەواو هۆشـیارنە و پـڕ لـە وزە، بـەڵام دواتـر نـۆرە دەگاتـە سـەر هەڵخلیسـکان و ڕاسـتیەکان.

«وای، خوایـا، گۆرەوییەکانـت بـە هەمـوو شـوێنێکدا پـەرش و بـڵاو کردوونەتـەوە، شـێتی گەمـژە! سیفۆنەکەت کێشـاوە، بـەڵام هێشـتا شـەپلە گووەکانـت لـە نێـو تەوالێتەکـەدان!»، واتـە ئـەوەی کـە پەیوەنـدی مرۆڤـی ناچێتـە پێشـەوە، هەرگیـز نەدەچـووە پێشـەوە و هیـچ کاتیـش ناچێتـە ئامانجیـش چوونەپێشـەوە نییـە. مرۆڤـەکان بـۆ ئـەوە دروسـت کـراون کـە نیـوەی کات بـە تەنیـا بـن و نیوەکـەی تریـش پێکـەوە. هەمـووەندەم بـۆ ژنـان سـەرنجڕاکێش بوومـە، بـەڵام لـە هەمـان کاتـدا ئیحساسـم ئـەوە بـووە کـە خەریکـی خواردنـی گۆشـتێکی کاڵـم کـە ناتوانـم واز لـە جوینـی بێنـم ئەمەیـش فێڵێکـی پیسـە. مـن مەزهەبـی نیـم، بـەڵام گیـرۆدەی ئـاکارە نەفرەتییەکـەی چاکەکارانیشـم. نامەوێـت کـە تەنیـا...

لێگەڕێیـن.. خـووی ئـەوەم گرتـووە کـە پـاش ئـەوەی دەردەچـن بـۆ سـەر کارەکەیـان، کەنتۆرەکەیـان بکەمـەوە و سـەیری پێڵاوەکانیـان بکـەم و دواتـر دەچمـە حەمامەکەیانـەوە و وێنـەی قلەکورەکەیـان دەبینـم، بـە خـۆم دەڵێـم: «سـەیرکە گەمـژە، ئـەو لەگـەڵ کەسـێکی دیکـەدا دەژیـت! باشـترە وازی لـێ بێنـی.» و ئـەوان دەڵێـن: «تەلەفـۆن بـۆ شـوێنی کارەکـەم بکـە»، «سڵاو عەزیزەکـەم»، و تـۆ هـەر بیـری لـێ ناکەیتـەوە، لـە نێـو جێگەکەیاندا دەخـەوی، ئەمـە تۆقێنـەرە و دواجـار وەئـاگا دێیـەوە و دەڵـەی «ئێـرە چ گوویـەك دەخـۆم؟ خەریکـی چیـم؟» پارچـە گۆشـتێك هێنـدە گرنـگ نییـە! چونکـە ئـەو کاتـەی کـە هاتـی، دەبـوو چەنـد ڕۆژێـك بەبـێ هاتـن بەسـەر بەریـت ـ بەلایکەمـەوە مـن وەهـام: شەسـت سـاڵمە. هەمـوو ڕووداوەکـە زۆر سەرهێنشـێنەرە. خـۆ (دیکامـرۆن بۆکاچیـۆ)ت خوێندوونەتـەوە. ئـەم کتێبـە کاریگەرییەکـی گـەورەی لەسـەر ژنـان هەبـووە. بیرۆکـەی ئـەوەی

کە جووتبـوون شـتێکی گاڵتەجاڕانەیـە. عەشـق لەگۆڕێـدا نییـە، تەنیا جووتبـوون نەبێـت، بـەڵام عەشـق بەچێژتـرە، قۆشـمانەترە.
ئەم پیاوە ـ دیکامرۆن ـ!
بەڕاسـتی شـیاوی پێکەنیـن و لـە هەمانکاتیشـدا شـارەزا بـوو. دەبێـت پێنـج هـەزار جـار سـووتابێت تـا توانیبێتـی ئـەم کتێبـە بنووسـێت یـا ڕەنگیشـە تەنیـا کـەرە قەرەواشـێك بووبێـت. نازانـم. هەربۆیـە عەشـق قۆشـمەییە، چونکـە ئەنجامێکـی نییـە و جووتبوونیـش قۆشـمەییە، چونکـە بەردەوامییەکـی تـەواو و وەهـای نییـە.

**های تایمز: کەوایە چی قۆشمە نییە؟**
بۆکۆفسـکی: کاتـی نێـوان ئـەم دووانـە، چاوەڕوانـی نێـوان جووتبـوون و عەشـق و ڕووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ باشـییە بەرهەمهاتووەکانـی ـ نـەوەك تاڵیەکانـی. بـە بـڕوای مـن دەبێـت بـە چاکـی لەگـەڵ ئـەو کاریگەرییـەی کـە لـە سـەرمانی دادەنێـت، هەڵکەیـن. ئیـتر ئـەو سـوودەی کـە پـاش خـۆی جێـی هێشـتووە، بـاش نییـە. بـە دەربڕینێکـی دیکـە، وەفاداریـی بـە هەمـووی، هەرچەنـد هەمـووی بـە باشـی نەچووەتـە پێشـەوە. وابزانـم پێویسـتم بـە کەمێـك چانـس و کەمێـك هەلـەکا و حـاڵ و کەمێـك تواناییـ هەیـە و کەمێکیـش شـەهامەت لەبـۆ درێژەپێـدان. ئەگـەر (هەمینگـوای) مابایـە، دەیگـوت:
«قەشـەنگی لـە کاتـی بەدبەختـی»، هەرچەنـدە باشـتری لەمـە گوتـووە. شـەهامەت واتـە درێـژەدان، لـە کاتێکـدا کـە هەمـوو شـتێك تۆقێنـەرە. ئەگـەر گاراجـت هەبێـت، ئۆتۆمبێلەکەتـی تێـدا ڕادەگریـت ـ ئەگـەر ئۆتۆمبێلـت هەبێـت ـ دەرگاکـەی بـە قایمـی پێـوە دەدەی، دەسـتپەڕ لێدەدەی و لەبـری ئـەوەی کـە گـەرووی خـۆت ببـڕی، گۆڤـار دەخوێنیتەوە. ئەمـە واتـە بەرگـری لـە بارودۆخێکـی تۆقێنـەر کـە هیـچ شـتێکی تێـدا ناچێتـە پێشـەوە و تـۆ خوایەکـت نییـە کـە ڕووی تـێ بکەی، لەوانـە نیت کە

دەچنە کڵێسە. سەیری دیوار دەکەی و بە تەنیایی چارەسەری دەکەی. ئەگەر بە کارێکی قورسی نەزانی، کولیچە هەیە، کولیچەی ڕەق. ڕاکردن بۆ شوێنێك، چنگلێدان لە شتێك، خوا، ژن یا دراگ، سەرکەوتنی یەك شەوە، بۆ شەو، بۆ حەفتە، ساڵ، بۆ هەمیشە، خەڵکی کاتی تەواو تەرخان ناکەن بۆ ئەوەی بزانن کە چ قوزەڵقورتێکن.

**های تایمز: دەزانم حەزت لەم پرسیارە نییە، بەڵام مەشرووب جۆرێك نییە لە ڕاکردن؟**

بۆکۆفسکی: دەمزانی هەر ئەمە دەڵەی. هەر لەبەر ئەو بوو کە قسەم لەسەری نەکرد! بەڵام دەزانی بەڕاستی مەشرووب بێوێنەیە. بواری ئەوەت دەداتێ تا خۆت بکوژی و دووبارە زیندوو ببیەوە و خۆت دووبارە بکوژییەوە. مەرگی مەشرووبخۆرێك درێژماوەیە. مادە هۆشبەرەکان خێران، ئەگەر بڕوات بە خوا هەبێت کە هەر چۆنێك بێت، مردووی. چونکە هەموو پرۆسەی مێشکت بەخشیوە بە کەسێك بێجگە لە خۆت. مەشرووب، پرۆسەی مردنە، بەڵام بە هێواشی. بە دەربڕینێکی دیکە، بە جارێك تەواوت ناکات.

لەبری خۆبەدەستەوەدانی خێرا، ئینج ئینج تەواوت دەکات. بەردەوام چاوەڕوانی ئەوەی کە ڕەنگە ڕووداوێکی باشتر ڕوو بدات. هەر خۆم لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە ئەم کارەم کردووە. ئێستایش (BMW) یەکم هەیە، لە خانوویەکی گەورەدا دەژیم، لە کوورە دیوارییەکەمدا دارم هەیە، ئێوە خەریکی گوتوبێژن لەگەڵمدا، بە بڕوام هەموو شتێك باشە، بەڵام من دەزانم کە بەم شێوەیە نییە.

من دەزانم کە هەموو شتێك ڕێك وەك هەمیشەیە: شێوە دەگۆڕدرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دەزانم کە خراپن. هەموودەم خراپ دەبن.

**های تایمز: لەبارەی خۆتەوە قسە دەکەیت یا بە گشتی لەبارەی**

**هەمـوو دنیـاوە؟**
بۆکۆفسـکی: لـە ڕاسـتیدا لەبـارەی خۆمـەوە، چونکـە ناتوانـم لـە جیاتـی کەسێکی دیکـە بیـر بکەمـەوە یـا ئیحسـاس بکـەم. بـەڵام واپێدەچێـت کـە خـۆم وەهـام، چونکـە زۆربـەی ئـەو نامانـەی کـە لەبـارەی کارەکانمـەوە بـە دەسـتم دەگـەن، تیایانـدا نـووسراوە:
«بۆکۆفسـکی تـۆ لـە گا دەچـی و هـەر زیندووشـی. بڕیـارم دا کـە خـۆم نەکـوژم.» یـا «تـۆ گەمـژەی پیـاو، شـەهامەتی ژیانـت پـێ بەخشـیم.» کەوایـە کاتێـك کـە مـەشرووب دەخۆمـەوە و دەنووسـم، ژیانـی کەسـانی دیکـە ڕزگار دەکـەم، نـەك ئـەوەی کـە بمەوێـت خـۆم ڕزگار بکـەم.
هیـچ حەزێکـم نییـە بـۆ ڕزگارکردنـی ژیانـی کەسێکی دیکـە، بـەڵام وەك بڵـەی کـە ڕزگاریشـیان دەکـەم. گەمژەیـەك ژیانـی گەمژەیەکی دیکـە ڕزگار دەکات، باشـە؟ دەبینـن، ئەمانـە خوێنەرەکانـی منـن؟ هەمـوو کتێبەکانـم دەکـڕن ـ مرۆڤگەیلـی شکسـتخواردوو و شـێت و نەفرەتـی ـ و مـن شـانازی بەمـەوە دەکـەم.

**های تایمز: خەریکە سەرم دەخەیتە سەر و گاڵتەم پێ دەکەیت؟**
بۆکۆفسـکی: کەمێـك. بـەڵام نـەك بـە تـەواوی، چونکـە ئـەو کەسـایەتییە سـەرەکییەی کـە لـە کارەکانمـدا هێرشـی دەکرێتـە سـەر، خۆمـم و بەلانـی کەمـەوە هـەر لـە ئەساسـەوە خـۆم هەمـوو ئـەو کەسـانەم کـە بـە دەوروبەرمـەوەن.
ئەمە شتێکە کـە واپێدەچێت فیمینیسـتەکان تێـی نەگەیشـتبن، مەبەسـتی نێـو دێـرەکان تـێ ناگـەن.

**هـای تایمـز: لەگـەڵ ئەوەیشـدا، گرووپێـك ژن لـە ڕۆم شـانۆگەری (بۆکۆفسـکی، خۆشـمان دەوێی)ـیان بـردە سـەر سـەکۆی شـانۆ، ئـاگات لێیـە؟**

بۆکۆفسکی: کاتێك کە هەموو ئەم شتە باشانە لەبارەی خۆمەوە دەبیستم، چلۆن دەتوانم درێژە بە نووسین بدەم؟ من شتی خراپم زیاتر خۆش دەوێت. هەموومان بە هاودژییەکانمانەوە خۆش و جوانین. (داستایۆفسکی) دەڵێت: «هاودژی، سەرچاوەی ڕیالیزمە.»
هەرچۆنێك بێت، یەکێك لەوانەیە. داستایۆفسکی.. بەردەوام لە دەستیدا بوو. تاقیکردنەوەی کۆنی زەمەن. (سارۆیان) دەڵێت: «خرۆشی داستایۆفسکی!»
دەیتوانی بنووسێت. منیش دەتوانم بنووسم. ئەو (ئێس. کەی. وای )٦ بوو و منیش (فلیتوود مەك)٧. دەتوانی هەموودەم داستایۆفسکی و جان فۆنتەیش بخوێنیتەوە. دەبێت کارەکانی ئەم پیاوە بخوێنیتەوە. پیاوێکی زۆر قورس و قایمە و لە من باشتر دەنووسێت ـ بە لانی کەمەوە باشتر لە من ـ هەیەجانی مرۆیی فۆنتە بە تەنیایی لە هەموو ئەو کەسانە کە دێنە نێو کۆڕە شیعرییەکانمەوە زیاترە. جان فۆنتە هاوڕێی منە لە کەسنەزان. عاشقیمە. کەسێکی جاویدانە. هەموو کارەکانی نەمرن.

**های تایمز: خۆت بە نووسەرێکی ئیرۆتیك دەزانی؟**

بۆکۆفسکی: ئیرۆتیك! من لەبارەی هەموو شتێکەوە دەنووسم. هۆکاری ئەوەی کە جووتبوون لە زۆرێك لە چیرۆکەکانمدا هەیە، ئەوەیە کە کاتێك لە تەمەنی پەنجا ساڵی وازم لە کارکردن لە بەڕێوەبەرایەتی پۆستە هێنا، ناچار بووم پارە پەیدا بکەم. ئەو کارەی کە خۆم حەزم لێبوو بیکەم، نووسین لەبارەی پرسگەلی تایبەت بە خۆمەوە بوو. بنکە و مەکتەبی هەموو ئەم گۆڤارە پۆڕنۆگرافانە لە شەقامی (ملێرز) بوو و ئەوانیش بابەتەکانی منیان لە (فری پرێس)ـدا خوێندبووەوە و هەر بەو شێوەیە بوو کە داوای چیرۆکیان لێ کردم تا بۆیان بنێرم. بۆیە تەنیا کارێك کە دەبوو بیکەم ئەوە بوو چیرۆکێکی باش بنووسم و لە نێوەی کارەکەیشمدا ناچار بووم چەند دیمەنی ناقۆڵای

جووتبوونی تێ بخەم. بەم شێوەیە چیرۆکەکەم دەنووسی و لە کاتی شیاودا دەمگوت:

«زۆر باشە، ئێسا کاتی ئەوەیە دیمەنێکی جووتبوونی تێ بخەم.»

ئەم کارەم دەکرد و درێژەم بە چیرۆکەکەم دەدا. زۆر باش دەبوو، چیرۆکەکەم پۆست دەکرد و یەکسەر چێکێکی (٣٠٠$)یم بەدەست دەگەیشت.

**های تایمز: بەڵام خۆت چیرۆکەکانت بە ئیرۆتیک هەژمار دەکەی، هەست دەکەی کە خەڵکی بە خوێندنەوەیان دەورووژێن؟**

بۆکۆفسکی: نازانم. هەندێک بۆیان نووسیوم کە چەند چیرۆکێکم دەبنە هۆی ئەوەی کێریان ڕەپ بێت، بەتایبەتی چیرۆکی (دێو) کە ئەو چیرۆکەم لەبارەوە پیاوەێکەوەیە دەستدرێژی دەکاتە سەر کچێکی بچکۆڵانە و خوێندنەوەیشی دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی کێریان ڕەق بێت و هەستێت.

بەڕاستی شتێکی ئەوتۆ نازانم. ڕەنگە زۆرێک لە خەڵکی گەرەکیانە وەها کارێک بکەن و تەنیا یاسا و ترس دەبێتە لەمپەر لەبەر دەمیان. ڕەنگە ئەم کارە ڕاست بێت کە بە وەسفکردنی جلەکانی ئەو کچەی چیرۆکەکەم، وردە وردە باسەکەم درێژ کردووەتەوە تا ببێتە هۆی هەیەجاناویبوون و وەئاڵۆشهاتنی خوێنەر، بەڵام خۆم لە کاتی نووسیندا کێرم هەڵنەستابوو.

**های تایمز: لەمەڕ (هێنری میلەر)ەوە چ دەڵەی؟ بە بڕوای تۆ میلەر نووسرێکی ئیرۆتیکە؟**

بۆکۆفسکی: من ناتوانم هێنری میلەر بخوێنمەوە. ئەو دەستی کرد بە قسەکردن لە ڕیالیتە، بەڵام دواتر بووە دەروونگەرا و دەستی کرد بە قسەکردن لە شتی دیکە. یەک دوو لاپەڕەی باش، دواتر جادەی خۆڵ و

چوونە نێو ناوچەیەکی ئاوارتە و دوورکەوتە. ئیتر ناتوانم نووسینەکانی ئەو بخوێنمەوە. هەست دەکەم فریوم دەدات.

**های تایمز: فریودان؟ مەبەستتان چییە؟**

بۆکۆفسکی: ئەو لەوێ نامێنێتەوە. من دەمەوێت ئەو لە شەقام بمێنێتەوە نەوەك لە هەوادا.

**های تایمز: کەوایە نووسینی باش ئەو نووسینەیە کە لە حەقیقەتدا بمێنێتەوە، لە شەقام.**

بۆکۆفسکی: من نەمگوت دەبێت بەم شێوەیە بێت، گوتم بۆ من بەم شێوەیەم. هەر لەبەر ئەوە هەوڵ دەدەم لە هەر شوێنێك بم ئەوا لە شەقامەکاندا بمێنمەوە، هەوڵ دەدەم لە ڕاستییدا بمێنمەوە. من تەنیا باسی شتەکان دەکەم، هەوڵی شرۆڤەکردنیان نادەم. کەڵکەڵەی من تەنیا ئەو شتانەیە کە دەیانزانم. شتگەلێك کە نایانزانم، بیرم داگیر ناکەن. وەك بەڕێوەبەرایەتی پۆستە. زۆرجاران کورەکان دەیانگوت: «شتێك کە نەزانم زیانم پێ ناگەیەنێت. ئەگەر ژنەکەم خەریکی گاندان بێت و من ئاگام لێی نەبێت و پێی نەزانم، واتە بەگان نەچووە و نەگانراوە.»

زانیارییەکانیشم هەر ئەو شتانەن کە دەیانبینم. کاتێك کە لە تەختی نووستنەکەمدا ڕادەکشێم و سەیری تەلەفزیۆن دەکەم، هەموو شتێك کە بیزانم (جۆنی کارسۆن) ٨ ـە: ڕئالیتە! هەست دەکەم لە خەڵکی شەقام نێزیکترم تا خەڵکانی دیکە و هەر جارەی پلەی کەسێك کەمێك بەرزتر دەبێتەوە، پەڵەیەکەی دەکەوێتە سەر. هەر لەبەر ئەوەیە دەبێت ئاگادار بیت، کارەکەت بکەی و تەنیا بێدەنگ بیت. هاوارەکانت لەسەر کاغەز بنووسە، بەڵام ڕێگە مەدە زۆر ببینرێیت. بیر لەمە بکەوە:

چ شتێك جادوو لە نێوان دوو کەسدا دروست دەکات کە یەکێکیان ئەفرێنەر و ئەویتریان گوێ لە ئەفراندن دەگرێت؟! زۆر جاران بیر لەوە دەکەمەوە کە سیحر و جادوو لە کەسانی گۆشەگیردایە، نەوەك بە دەستی ئەنقەست، بەڵام دەبێت ئەم گۆشەگیرییە بێتە پێشەوە. کاتێك ئارتیست تێکەڵ بە عەوام دەبێت، ئەوا ئارتیستەکە دەبێتە بەشێك لە عەوام.

**های تایمز: هەر لەبەر ئەوە بوو کە ساڵی ڕابردوو بەشداری فیستیڤاڵی نێونەتەوەیی شیعری (کاستێل پۆرێزیانۆ)ی ئیتالیات نەکرد؟ یەکێك لە کەسە نائامادە مەزنەکانی ئەوێ بووی.**

بۆکۆفسکی: من نەچووم، چوونکە چەند شاعیرێکی ئەمەریکی لەوێ بوون کە حەزم لێنەبوو لەگەڵیاندا شیعر بخوێنمەوە. لە (سانتیا مۆنیکا)ی کالیفۆڕنیایش هەر لەگەڵیان شیعرم نەخوێندەوە. تەنانەت نامەوێت لە ژوورێك لەگەڵیاندا بم.

هەر ئەوە بوو کە نەچووم. حەزم لە هاوڕایی نییە. نامەوێت ناوی کەس ببەم، بەڵام ئەگەر ئەوەی گوتت کە خۆڵبارانکردنیان ڕاست بێت، زۆر دڵخۆشم. منیش کە ئەوان شیعر دەخوێننەوە، حەزم لەوەیە هەر ئەوەیان بەرامبەر بکەم. هەست دەکەم خەریکە دەرشێمەوە و ڕشانەوەکەمیان تێ گرم.

**های تایمز: بەڵام لەوێ خەڵکی حەزیان لێبوو گوێ لە شیعرەکانی بۆکۆفسکی و گینزبێرگ بگرن...**

بۆکۆفسکی: نا، کەمێك بوەستە، گێژمان مەکە...

**های تایمز: زۆر باشە، بەڵام (ئالێن) هەر وەك خۆت، لە ئیتالیا نمونە و جێی سەرنجە.**

بۆکۆفسکی: کێ؟ ئالێن؟ [بە تانەوە] ئالێن زۆر باشە، ئالێن باشە، بەڵێ، هەموو ئەوانە شاعیری باشن: (گیرگۆری کۆرسۆ) و (کوپە دۆستەکەی گینزبێرگ) و (جۆنان باتێز)، (تیمۆتی لیری)، (فرانك زاپا)، (بۆب دیلان) و . فەرهەنگی ئەمەریکا زۆر باشە، فەرهەنگی ئەمەریکا.. بە بڕوای من هەموو ئەم فەرهەنگە دواکەوتنێکی درێژماوەی هەیە. وەك ئەوەیە کە جەستەیەکە کلکێك بە دوای خۆی ڕابکێشێت و کلکەکەیش لە پشتە سەریەوە لە خاك و خۆڵ وەردرێت.

**های تایمز: ڕوانگەت لەبارەی فیلمی (بار فلای)یەوە چییە؟**

بۆکۆفسکی: بەڕاستی من هیوایەکی زۆرم بە (بار فلای) هەیە، نەك لەبەر ئەوەی کە من و (باربێت ـ شرۆیدەر) زەحمەتێکی زۆرمان بۆی کێشا، بەڵکو بەو هۆیەی کە بە بڕوای من عەزیزێکی جوانکیلە و باشمان تیایدا هەیە، بەڵام چلۆن دەمانەوێت ئەمە بسەلمێنین؟ زۆر دژوارە!

دەزانم ئێستا چ ڕوودەدات، هەڵاوسان، بەهای(٪٢٠) قازانجی چووتە سەرەوە. تووڕە دەبم کە ئەمە دەڵێم، بەڵام من وا بیر دەکەمەوە ئەگەر بار فلای بە شێوەیەکی ڕاست بەڕێوە ببرێت لە (فڕین بەسەر هێلانەی کۆترەباریکە) باشتر دەبێت، ڕاستیتر بوو، چونکە لەبارەی شێتخانەوەیەکە کە شێتخانە نییە و دەرگا بە ڕووی بەندکراوەکانییەوە قفڵ نەکراوە.

**های تایمز: بار فلای چیرۆکی هەیە؟**

بۆکۆفسکی: چیرۆك و باسی هەیە، هێندە وزە و تاقەتی هەیە کە هەمووان لە شێوەی (پاپ کۆرن)ـی خواردن ڕابگرێت. سەرگەرمکەرانەیە. هەوڵ دەدەم شتگەلێك کە (٣٠) ساڵ بەر لە ئێستا ڕوویان داوە، بە شکۆ و جەبەڕووتانە تۆماریان بکەمەوە.

چیرۆکێکی ئۆرجینالە. هیچ کاتێک شتێکم لەم بارەوە نەنووسیوە. چیرۆکی سێ یا چوار شەوی ژیانی خۆمە لە تەمەنی (٢٤)ساڵی و (٩٣٪)ی ڕووداوەکان ڕاستین.

**های تایمز: باشترین پێناس کە خوێنەرێکی نێرینە دەتوانێ لە تۆی بکات، چییە؟ و باشترین پێناس کە خوێنەرێکی مێینە دەتوانێ بیکات، ئەویان چییە؟**

بۆکۆفسکی:خوێنەرە مێیەکان هەموویان لێک دەچن. کاتێک کوڕێکی شیعرخوێندنەوەم هەیە، دێنە پێشەوە و دەڵێن «دەمەوێت بتدەمێ.» پیاوەکان وەها ناڵێن،

«تۆ. سەیروسەمەرە و بێهاوتای!» کەوایە خوێنەرە ژنەکان کەمێک زیاتر هەیەجانیان بۆم هەیە. وابزانم پیاوەکان زیاتر خۆشیان بوێم.

**های تایمز: هەموودەم لە کتێبەکانتدا لەبارەی چێژ و ئاڵۆشە سێکسییەکانەوە دەنووسیت، بەڵام شتێکمان لەبارەی ژنێکەوە کە لەگەڵتاندا عیشقبازی و دەستلەملانە، نەبیستووە..**

بۆکۆفسکی: لە ڕاستیدا من بە چێژ و لەزەتەکانی خۆمەوە دەست پێ دەکەم، ئەگەر شتێکی بۆ ئەوان لێ بمێنێتەوە. کاتێک کە ڕەحەت دەبم، کارەکە تەواوە.

دە چرکە، و تەواو. هەندێک جار تەنیا سێ یا چوار خوولەك درێژە دەکێشێت و هیچ کاتیش دەنگوباسی پێشلەملان و شتی وا لە گۆڕێدا نییە. هەموو ڕووداوەکە ئەمەنەیە. ڕەحەت دەبم و تەواو، ڕێگە دەدەم تۆوەکەم بێتە دەرەوە تا بتوانم سەیری تەلەفزیۆن بکەم. کارێک کە من دەیکەم، هەر ئەوەندەیە.

**های تایمز: و دواتر (جۆنی کارسۆن)، کۆتاییەکی باشە؟**

بۆکۆفسکی: جۆنی کارسۆن پاش جووتبوون؟ هەندێک کات لەو جووتبوونەی کە پێشتر هەتبووە باشترە، هەندێک جاریش باش نییە. هەموومان شەوی ناخۆشمان هەبووە.

**های تایمز: نیگەرانی ئیحساساتی ئەو ژنە نیت کە هەوەسبازیت لەگەڵدا دەکات؟**

بۆکۆفسکی: باسی قسە پڕووپووچەکانی (ئازادی سێکسی) دەکەی؟ زۆر باشە، هەندێک کات هەوڵ دەدەم هەرچی لە توانامدا هەیە ئەنجامی بدەم، بە تێروتەسەلی. دەزانم میتکە لە کوێیە، هەموو ئەو کارانە دەزانم، دەزانم، دەزانم.

های تایمز: نیگەرانی بەها و حورمەتی خۆت نیت؟

بۆکۆفسکی: وەك عیشقبازێکی دیار؟ نا، ئەگەر کارەکانمیان حەز لێ نەبێت، دەڕۆن بۆ لای پیاوێکی دیکە، کارێك کە بەردەوام دەیکەن. پێشلەملانێکانیش با بۆ هەمان ئەو پیاوانە بمێنێتەوە.

**های تایمز: ئەوە ڕاست و دروستە کە پاش چەند ساڵ قەیرەبوون، دەستت کردەوە بە نووسین لەبارەی ژنانەوە؟**

بۆکۆفسکی: چەند ساڵ؟! نزیکەی دە دوانزدە ساڵ بێگان بووم. مرۆ پێویستی بەوەیە تۆوەکانی (سپێرم) دووبارە بەرهەم بهێنێتەوە یا دەشمزانی کە هەموودەم سەرئێشەی ژنان لە هەر شتێکی دیکە زیاترە.

**های تایمز: بەڵام ناچار بووی بەم ئەزموونەدا تێپەڕی و دەست بکەی بە دووبارە سەرجێییکردنەوە لەگەڵ ژناندا...**

بۆکۆفسکی: چونکە وەها بیرم دەکردەوە کە ئەگەر نووسەر دوانزە

ساڵیش بێ ژن بێت.. دەتوانی زۆر شت بنووسی، بەڵام ئەگەر خاڵی بێت لە نیوی ڕەگەزەکەی دیکەی مرۆڤ، ئەوا مرۆڤێکی کامڵ نییە. نازانم چ شتێکی حیزت بە مێشکدا دەڕوات، دەی؟!
مەبەستی من ئەمەیە کە پێویستت بە هاوسەنگییەك هەیە. ئەگەر دەتەوێت بە خراپی لەبارەی ژنەکانەوە بنووسیت، دەبێت سەرەتا لەگەڵیاندا بژیت. کەوایە بۆ ئەوەی بتوانم لە نووسینەکانمدا ڕەخنەیان لێ بگرم، لەگەڵیان دەژیم. وادەزانی ئەو دوانزە ساڵەی کە بێ گان بوومە، زۆر تۆقێنەر بووە؟ خەریك بووم خۆم بۆ سووپایەك لەو ژنانە ئامادە دەکرد کە لە ڕێدا بوون. واپێدەچوو دەمزانی ڕووداوێکی لەم شێوەیە ڕوودەدات. لەسەر بڕیاری خۆم نەبوو، ڕووداوەکانی ژیان بەس ڕوودەدەن. من تا تەمەنی بیست و سێ ساڵیش کەسم نەگابوو. ئێستا شەست و یەك ساڵمە و دواهەمین جووتبوونیشم ساڵێك بەر لە ئێستا بوو.

**های تایمز: ئەوە بەڕاستتە، بۆ؟**

بۆکۆفسکی: دەرفەتی ئەوەم بدەرێ تا بۆت ڕوونتر بکەمەوە. جووتبوون بۆ مُن وەکو لەفەیەکی ڕۆنەکەرەی سێوەبنعەرزیلە وایە. وادەزانی کاتێك کە خەڵکی دەگەنە تەمەنی بێهیوایی و ئیتر جووتبوون بۆیان مەحاڵ دەبێت، چ دەقەومێت؟
هۆکاری ئەو هەموو دەنگۆ و قرموقاڵەی تایبەت بە سێکس چییە؟ واپێدەچێت کە هەموو شتێك سێکس بێت؟! ناکرێت بە بێ بیرکردنەوە لە جووتبوون پایسکیلسواری بکرێت؟ ئەگەر بیر لە جووتبوون نەکەمەوە، پیاوێکی هیچپێنەکراوم؟! ئەگەر (٥٠٪)ی شەو و ڕۆژەکانم، لەت نەکردبێت، شێوازی بیرکردنەوەم هەڵەیە؟ دژی گانکردن نیم، بەڵام وابزانم بۆ ئەم کارە دەبێت بەهایەکی قورس ببەخشرێت. خەڵکی وەها بیر دەکەنەوە کە من ئاوێتەی جووتبوون بوومە. من

گان دەکەم، باشیش دەگیەم و لەبارەیشیەوە چاك دەنووسم، بەڵام ئەمە بە واتای ئەوە نییە ئەم کارە بەهایەکی وەهای نییە. خەڵکی گەرەکیانە بێنە ئێرە و بڵێن:
«هۆی بۆکۆفسکی، وا دێم مەست بکەین، چەند قەحپەشم پێیە.» حەزم لێ نییە: «هۆی. قەحپەکانتم ناوێ.» ئەوان وا دەزانن ئەم کارە گرنگە. لە ڕوانگەی منەوە وا نییە. من تەنیا شتگەلی باش لەبارەی جووتبوونەوە دەنووسم، بەڵام هەر بەم باشییەیش دەمتوانی لەبارەی هێلکەوڕۆن دروستکردنیش بنووسم، کارێك کە نەمکرد.

**های تایمز: ئەو کتێبەی کە لەبارەی منداڵیتەوەیە (٩)، چی لێهات؟**
بۆکۆفسکی: یەك لەسەر چواری تەواو بووە، هەڵەبرەکەم دەڵێت ئەمە باشترین کارە کە تا ئێستا نووسیومە، بەڵام تەواو نەبووە. چیرۆکێکی ترسناکە و نووسینی ئەم کارە دژوارترە لە کارەکانی دیکە، چونکە زۆر جدییمە تیایدا. هەوڵم داوە کەمێك بەتام و خۆشی بکەم تا ترس منداڵیم داپۆشێت.

**های تایمز: ژیانی منداڵیت ترسناك بوو؟**
بۆکۆفسکی: ئاە.. بەڵێ. بەشی (H)، بۆ تا ئێستا ڕوویداوە کە بە سیرمە لێت بدەن، ئەویش سێ جاران لە حەوتوویەکدا، لە تەمەنی شەش ساڵییەوە تا یانزە ساڵی؟! دەتوانی هەموو ئەو لێدانانە کۆبکەیتەوە؟

**های تایمز: باوکت لێی دەدایت؟**
بۆکۆفسکی: بەڵێ، بەڵام دەبینی کە ئەم لێدانانە ڕاهێنان و مەشقێکی باش بوون بۆ ئەدەبیاتم. لێدان بە سیرمە فێری زۆر شتیان کردم.

**های تایمز: چ شتێك؟**

بۆکۆفسکی: تایپکردن.

**های تایمز: چ پەیوەندییەکیان بە یەکترییەوە هەیە؟**

بۆکۆفسکی: پەیوەندییەکەیان ئەوەیە کە کاتێك بە خێرایی و توند تێت دەسرەوێنن، مەیل و حەزت بۆ گوتنی هەر شتێك کە لەو کاتەی بە مێشکتدا دێت، دەجولێ. بە دەربڕینێکی دیکە، لێدانەکان دووڕووییت لێ دوور دەکەنەوە. ئەگەر بتوانی تەحەمولی بکەی و تێیپەڕێنی، بەرهەمەکەی پاکیەتییە. کەسێك کە لە منداڵی بە توندی سزا دەدرێت، پاش بەسەربردنی ئەو سەردەمە دەتوانێت زۆر بەهێز بێت، زۆر باش و یا بشبێتە پانتۆلپیس، پیاوکوژ و یا هەم بگاتە شێتخانە و هەموو ڕێڕەوەکانی بزر دەکات. بەمەیش، دەبینی باوکم فێرکەرێکی گەورەی ئەدەبیات بوو: ئەو، فێری مانای ئازاری کردم، ئازاری بێهۆکار...

**های تایمز: هەر لەبەر ئەوەیە لە گۆشەگیریدا دەنووسیت و پەیوەندییەکی وەهات لەگەڵ خەڵکی نییە؟ و یا هەر لە بنەڕەتەوە لەبەر ئەم هۆکارەیە کە دەنووسیت؟**

بۆکۆفسکی: لە ڕاستیدا کەس نازانێت بۆچی بوومەتە نووسەر. من تەنیا دەڵێم باوکم لە ژیاندا فێری وانەیەکی کردم، ڕووی ڕاستەقینەی ژیان و خەڵکی نیشان دام و ئەم خەڵکە ئێستا زیندوونە. هەموو ڕۆژێ ئەم خەڵکە دەبینم کە لە نێو شاڕێگەکاندا خەریکی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلن.

**های تایمز: چ جۆرە خەڵکێك؟**

بۆکۆفسکی: من بە خێرایی (٥٠) میل لە سەعاتێك و لە سایدێکی جادەیەکدا بە پشت یەکێکەوە ئۆتۆمبێل لێدەخوڕم. بەملاو و بەولایدا

دێم و دەچم.. هەوڵ دەدەم وەپێشی کەومەوە. ئەو خێراییەکەی دەگەیەنێتە (٦٠)، منیش دەیگەیەنمە (٦٥) و ئەو پێ لەسەر بەنزینەکەی دادەنێت تا بنەبانی. لە جۆری بەشەردا شتێك هەیە زۆر هیچ و پووچە و زەرەریشی زۆرە. باوەڕ بکەن ئەوە لە ئۆتۆمبێل هاژووشتنی نێو جادەکان دەبینم. ئەگەر کەسێك بیهەوێت پێش من بکەوێت، خێراییەکەم کەم دەکەمەوە و ڕێگەی پێ دەدەم تا تێپەڕێت، ئاخر ناکرێت هیچ حیسابێك لەسەر جۆری بەشەر بکرێت و سیقەی پێ بکرێت.

**های تایمز: هەموودەم ئیحساساتت وەها بووە؟**

بۆکۆفسکی: گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە، هیچ گۆڕانێکم تێدا نەبینیوە. لە یەکێك لە شیعرەکانمدا نووسیومە: «هەر لە سەرەتاوە خاوەنی مرۆڤایەتی نیت.» هۆکارێکم بۆ گۆڕینی ئەم نیوەدێرە نەدۆزییەوە.

**های تایمز: هەست دەکەم زۆرت خوێندووەتەوە؟**

بۆکۆفسکی: دەبوو لە تەمەنی پانزە ساڵی تا بیست و چوار ساڵی کتێبخانەیەك کتێبم خوێندبێتەوە. ئێوارەخوانم کتێب بوو. هەمووجەم باوکم سەعات هەشتی شەو دەیگوت: «چراکان بکوژێننەوە!» دەیهەویست شەوان زوو بخەوین و بەیانیان زوو لە خەو هەستین و وەدوای ژیانمان بکەوین و هەر کارێك کە هەمانە بە باشی ئەنجامی بدەین، بیرۆکەیەك کە تەواو بێمانایە.
ئەمانەم دەزانی، بەڵام کتێبەکانم بە پلە لە باوکم سەرنجڕاکێشتر بوون. لە ڕاستیدا خاڵی ڕەهەندی بەرامبەرەکی باوکم بوون: کتێبەکان ڕۆحیان هەبوو، ڕاڕایی و قەڵەقیان هەبوو. بە کورتی، کاتێك باوکم دەیگوت:
«چراکان بکوژێننەوە»، چرایەکی بچووکم دەبردە نێو جێگاکەمەوە، لە

چرپاندم بە یەکێك لە گوێیە گەنیوە گەرمداگەڕاوە پیسەکانیدا:
**«خوا پشت و پەنامان بێت.»**
لەوەی کە هەردووکمان مەست بووین، درێژەمان دایێ. چەند جارێك کەوتمە سەر زەوییەکە، بەڵام دووبارە بە پرتاو دەچوومەوە نێو گۆڕەپانەکەوە. دڵنیا بووم هەردووکمان حەزمان لێ بوو واز بهێنین، بەڵام وەك بڵەی ڕێگەیەکی دیکەمان بۆ گەڕانەوە نەدەدۆزییەوە.
گانکردن لە ڕووی ئەنجامدانی ئەرکەوە هەندێك جار زۆر ترسناك دەبێت. تەنانەت جارێکیان بە ناچار چنگم لە یەکێك لە مەمکە زلەکانی گیر کرد و گۆیەکەیم وەك (پان کێك)ـێکی شل و وڵ ئاخەنییە دەممەوە. تامی ئاڵۆسی دەدا. تامی کاندۆم و خوومـاری و ماستی ترشاو..
بە بێ دڵییەوە کێشامە دەرەوە و دووبارە ئاخەنیمە دەممەوە.

دواجار شەکەتم کرد، هەرچەندی کە هێشتا هەر خەریك بوو و دەبێت ددانی پێدا بنێم کە ئیتر وەك مردوو درێژ نەبوو، بەڵام تەواو ماندوو ببوو. من ڕیتمەکەیم دۆزیبووەوە و خۆم لەگەڵیدا ڕێك خست و ڕێك ئامانجەکەم پێکا، ڕێك خاڵی نێوەڕاست و چەندین جاریش، تا ئەوەی دواجار وەك بینایەکی بەهێز کە نەیهەوێت ببێتە کەلاوە، ملی دا و داهێزا.

لووڵم دابوو. ئاخری کەوتە ئاه و ناڵەکردن و وەك منداڵێك دەستی کردە گریان و منیش تەقاندم.
جوان بوو.
دواتر خەوتین..
بەیانی کە لە خەو هەستاین، بینیم تەختی نووستنەکە ڕۆچووە.

بەو گانکردنە شێتانەیەمان هەر چوار پەلی تەختەکەمان شکاندبوو.

گوتم:

+ «ئای، خوای گەورە! خوای گەورە!»

- «چت لێهاتووە هانك؟»

+ «تەختەکەمان شکاندووە!»

- «وای.. بەڕاست!»

+ «ئەرێ، بەڵام من پارەم نییە. نیمە تا خەسارەکەی بدەم.»

- «منیش پارەم نییە.»

+ «واشبزانم دەبێت پارەیش بدەمە تۆ، ئان؟»

- «نا تکایە، پێویست ناکات، تۆ یەکەم پیاوی کە پاش چەندین ساڵ لەگەڵیدا خۆشم ڕابوارد.»

+ «باشە، سوپاس، بەڵام دەبێت بیرێك بۆ ئەم تەختە نەفرەتییە بکەمەوە.»

- «حەزت لێیە من بڕۆم؟»

+ «پێت ناخۆش نەبێت، بەڵام تکایە وا بکە. من غەمی ئەم تەختەمە.»

- «بە دڵنیاییەوە هانك. بەر لەوە دەتوانم بچمە سەرئاو؟»

+ «ئەی چۆن.»

جلەکانی لەبەر کرد و چووە نێو هۆڵەکەوە و لەوێشەوە بۆ مستەراوەکە(ئاودەست). کاتێك کە لە مستەراو هاتە دەرەوە، لە بەر دەرگاکە وەستا.

- «خوات لەگەڵ هانك.»

+ «خوات لەگەڵ ئان.»



لەوەی کە ڕێگەم دا بەو جۆرە بڕوات، هەستێکی بۆگەن و گوواویم هەبوو، بەڵام خەتای تەختی نووستنەکە بوو. دواتر بیرم کەوتەوە کە تەنافێکی درێژم هەیە بۆ خۆهەڵواسینم. تەنافێکی زۆر سفت و قایم بوو.

سەیرم کرد کە هەموو پێیەکانی تەختەکە لە نێوەڕاستەوە شکاون. تەنیا دەبوو وەك پێی شکاوی مرۆڤ لێکیان ببەستمەوە. شکاوییەکانم پێکەوە بەستنەوە. دواتر جلەکانم لەبەر کردن و چوومە قاتی خوارەوە.

خاتوونە خاوەنماڵەکە چاوەڕێم بوو:

**«من ئەو ژنەم بینی، ژنێکی سەرجادەیی بوو کاك بۆکۆفسکی. دەزانم کە لە ژوورەکەی ئێوە بوو. من هەموو کرێنشینەکانم باش دەناسم.»**

گوتم:

**«دایە، زۆرێك لە پیاوان بە بێ ئەو شتانە ژیانیان بەڕێوە ناچێت.»**

دواتر چوومە دەرەوە. لە بارێك دانیشتم. پەیکەکان وێك دەگەیشتنەوە، بەڵام من لە بیری تەختی خەوەکەدا بووم. بیرم کردەوە زۆر گەمژەیە ئەوەی بیهەوێت خۆی بکوژێت، کەچی لە خەمی تەختی نووستنەکەیدا بێت، بەڵام من ئەو خەمەم هەبوو. چەند پەیکێکی دیکەم خواردەوە و گەڕامەوە. خاتوونە خاوەن ماڵەکە چاوەڕێ بوو.

**«کاك بۆکۆفسکی، ئێوە ناتوانن بەو تەنافانەوە فریوم بدەن. تەختی نووستنەکەتان شکاندووە. ئای خوایا، دەبێت شتی زۆر لەسەری ڕوویدابێت کە بەو شێوەیە هەر چوار پەلی شکاوە!»**

گوتم:

+ «زۆر بەداخم. ناشتوانم پارەکەی بدەم. کارە پاکارییەکەیشم لەدەست داوە و هەرچی چیرۆکم نارد بۆ (هارپرێز) و مانگنامەی (ئەتڵەنتیک) بۆمیان ناردووەتەوە.»

- «باشە، تەختەکە دەگۆڕین.»

+ «بە تەختێکی نوێ؟»

- «بەڵێ، لەیلا ئێستا خەریکی تێککردنەوەیەتی.»

لەیلا، کچێکی زۆر جوانی چکۆڵەی پێست ڕەنگین و خزمەتکاری ئەوێ بوو. یەك دوو جار زیاترم نەبینیبوو. ئەویش ئەو ڕۆژانەی کە لەوێ کاری دەکرد من لە باڕ دادەنیشتم و خۆم مەست دەکرد. گوتم:

+ «باشە، من ماندووم. حەزم لێیە بچمە سەرەوە.»

- «بەڵێ، هەستم کرد کە ماندوونە.»

پێکەوە لە پلیکانەکان چووینە سەرەوە، بە پێش تابلۆیەکی قوماشیدا تێپەڕین کە لەسەری نووسرابوو:

(خوا بەرەکت بخاتە نێو ئەم ماڵەوە.)

کە خەریك بوو دەگەیشتینە کۆتایی پلیکانەکان و لە ژوورەکەم نزیك دەبووینەوە، خاتوونە خاوەن ماڵەکە گوتی:

+ «لەیلا؟»

- «بەڵێ؟»

+ «تەختەکەت تێك کردەوە؟»

- «وای خوایا، ئەستۆمی شکاند! ناتوانم پارەچەکانی تێك کەمەوە، هەندێك پارچەی تێك ناکەنەوە!»

هەردووکمان پێکەوە لە بەردەم دەرگای ژوورەکە وەستابووین.
گوتم:
**«گوێ بگرن خاتوونەکان، تکایە بمبوورن. دەبێت من چەند چرکەیەک بچمە سەرئاو.»**

چوومە سەرئاو و وردە وردە بیرە، ڤۆدکا، شەراب و ویسکیم هەڵڕشت. چ بۆنێکی پیس و ناخۆشی هەبوو.
سیفۆنەکەم کێشا و بەرەو ژوورەکەم گەڕامەوە. کاتێک نێزیک بوومەوە، گوێم لە دەنگی تەقەتەقی کۆتایی بوو. دواتر خاتوونی خاوەن ماڵ دەستی کردە پێکەنین و پاشان هەردووکیان پێکەنین.
چوومە نێو ژوورەکەوە. پێکەنینەکەیان وەستا. قیافەیەکی عەبووسم بە خۆمەوە گرت و کەمێکیش تووڕە. خزمەتکارە جوان و پێست ڕەنگینەکە دەچووە دەرەوە و لە پلیکانەکانەوە شۆڕ بووەوە و لەو دەمەدا بوو کە دووبارە گوێم لە دەنگی پێکەنینی بووەوە. دواتر خاتوونی خاوەن ماڵ لە نێو دەرگاکە وەستا و سەیری کردم.

**«کاک بۆکۆفسکی، هەوڵ بدەن ئاگاداری ڕەفتاری خۆتان بن. ئێمە لێرە تەنیا کرێنشینی بەڕێزمان هەیە.»**

پاشان بە هێواشی دەرگاکەی کردەوە و دواتر دایخستەوە.
سەیرێکی تەختی خەوەکەم کرد. لە ئیستیل دروست کرابوو.
جلەکانم داکەند و بە ڕووتی خۆم هەڵدایە سەر مەلافە نوێیەکانی تەختی نووستنەکە.

فیلادلفیا، سەعات یەکی پاش نیوەڕۆ..
تەنیا..

ئاشوودە..
خۆشویست لەبەردەم موعجیزە..
باش بوو..

***

**تێبینی:**

(دیدار مەسیفی)ـی ڕۆماننووس و هاوڕێی خۆشەویستم سەبارەت بەم چیرۆکی پێی گوتم کە ئەم چیرۆکە لە چوارچێوەی یادداشتەکانی بۆکۆفسکیدا بڵاو بووەتەوە و وەك چیرۆکێکی سەربەخۆ نەنووسراوە.

# (خۆکوژی - The Suicide)

بیرکردنەوە لە خۆکوژی، کاروباری ئاسایی (مارویـن دەنینـگ) بـوو. جاری وا هەبـوو، چەندیـن ڕۆژ و تەنانـەت چەندیـن حەوتـوو ئـەو بیرۆکەیەی لە مێشکیدا نەدەما و ئیحساسێکی ئاسایی تێدا دروست دەبوو، ئەوەنـدە ئاسایی کـە بـۆ ماوەیـەك بتوانێـت ئاسایب بژیـت. پاش ماوەیـەك دووبـارە ئـەو جـۆرە بیرکردنەوانـەی بـۆ دەگەڕایـەوە. ئیتر لـەو کاتانـەدا ژیـان بـۆی دژوار دەبـوو، ساعەت و ڕۆژەکانـی لە لای بێبەهـا دەبـوون.

دەنـگ و ڕووخسـار و ڕەفتـاری خەڵکـی، تووشـی حاڵەتـی ڕشانەوەیان دەکرد.

نهـۆ و بـە دەم لێخووڕینـی ئۆتۆمبێلـەوە لـە کارەکـەی دەگەڕایـەوە، هەستی خۆکوشـتن تێـوەی زابـوو. ڕادیـۆی ئۆتۆمبێلەکـەی کوژانـدەوە. خەریکـی گوێگرتنـی سـەمفۆنی سـێیەمی بتهۆڤـن بـوو.

مۆسیقا بۆ ئەو ناخۆش، بانگەشەدار و زێدەڕۆیانە بوو.

گوتی:

**«تف.»**

مارویـن بەسـەر پردێکـەوە لێـی دەخـوڕی کـە دەیگەیاندنـەوە ماڵەکـەی. پردێـك کـە لەسـەر یەکێـك لـە گەورەتریـن بەندەرەکانـی جیهـان دروسـت کرابـوو.

مارویـن لـە نێوەڕاسـتی پردەکـە ئۆتۆمبێلەکـەی ڕاگـرت. فـوول لایتەکـەی پـێ کـرد و هاتـە خـوارەوە. لـە تەنیشـت لێـواری پردەکـە کـە گوێسـەیەکی هەبـوو، وەسـتا.

لەسـەر گوێسـەکە پەیژەیەکـی ئاسـنین هەبـوو کـە بـە دڵنیاییـەوە نێزیکـەی سـێ مەتـر درێـژ بـوو. بـۆ چوونـە لایەکـی دیکـەی پردەکـە دەبـوو لـە پەیژەکـەوە سـەر کەوێـت. بـن پێـی ئاو بـوو. هێورکـەرەوە بـوو. زۆر جـوان.

کاتـی قەرەباڵغـی ترافیك نزیك دەبووەوە.

ئۆتۆمبێلەکـەی مارویـن سـایدی لاتەنیشـتی جادەکـەی گرتبـوو. ئەو ئۆتۆمبێلانـەی کـە لەو سایدەوە تێدەپەڕیـن، هەوڵیـان دەدا ڕێڕەوەکەی خۆیـان بگـۆڕن. هاتوچۆیەکـە گیـرەی تـێ کەوتبـوو.

هەندێـك لـە ئۆتۆمبێلـەکان لـە کاتـی سـایدگۆڕیندا هۆڕنیـان لـێ دەدا. لێخـوڕەکان لـە کاتـی تێپەڕیـن جنێویـان بـە مارویـن دەدا.

**«هۆی، گەلحۆی تۆ؟»**

**«چراویلـێ لێدە، ئاوەکەی گەرمە.»**

مارویـنیش هـەروا لـە ئاوەکـە ڕامابـوو. بڕیـاری دا لـە پەیژەکـە سـەرکەوێت. دواتـر گوێـی لـە دەنگێکـی دیکـە بـوو.

**«کاکە، حاڵتان باشـە؟»**

ئۆتۆمبێلێکی پۆلیس لە پشتی ئۆتۆمبێلەکەی مارویندوە وەستا بوو. گلۆپە سوورەکەی چاوترووکانێی دەکرد. ئەفسەرێکی پۆلیس لێ نزیک دەبوووە و ئەوانی دیکەیش لە نێو ئۆتۆمبێلەکەدا دانیشتبوون.

ئەفسەرەکە بە خێرایی بەرەو لای هات. پیاوێکی جەحێڵ بە ڕووخسارێکی لاواز و سپی.

**«کێشەتان چییە کاکە؟»**

**«بەڕێز ئۆتۆمبێلەکەم کوژاوەتەوە و سینی گرتووە و پێ نایێتەوە.»**

**«لەو سەرەوە چ دەکەی؟»**

**«خەریکی سەیرکردنم.»**

**«سەیری چی؟»**

**«ئاوەکە.»**

ئەفسەرەکە نزیکتر بووەوە.

**«ئێرە شوێنی تەماشاکردن نییە.»**

**«دەزانم. کێشەکە ئۆتۆمبێلەکەیە. من تەنیا لەم سەرەوە دانیشتوومە و چاوان دەگێڕم.»**

ماروین لە پەیژەکە هاتە خوارەوە. ئەفسەرەکە لە تەنیشتییەوە بوو. لایتێکی دەستی هەبوو.

«چاوەکانتان بکەنەوە، تکایە کراوە.»

ڕووناکی لایتە دەستییەکەی لە چاوی چەپی ماروین گرت، دواتر چاوی ڕاستی، پاشان لایتە دەستییەکەی بە کەمەریەوە شۆڕ کردەوە.

**«دەکرێت ئیجازەکەتان ببینم؟»**

ئەفسەرەکە ئیجازەنامەکەی وەرگرت.

**«هەر لەو شوێنەی کە وەستاوی، بمێنەوە.»**

ئەفسەرەکە گەڕایەوە لای ئۆتۆمبێلەکەیان. سەری کردە نێو پەنجەرەکەوە و لەگەڵ ئەفسەرەکانی دیکە دەستی کردە قسەکردن.

دواتر، قەدی ڕاست کردەوە و چاوەڕێ ما.

پاش چەند خوولەکێك گەڕایەوە لای ماروین و ئیجازەنامەکەی دایەوە.

**«دەمانەوێت ئۆتۆمبێلەکەتان لەسەر پردەکە بپەڕێنینەوە.»**

**«مەبەستتان ئەوەیە بانگی کرێن دەکەین؟ سوپاس.»**

ئۆتۆمبێلەکەی ماروین کەمێك لە نێوەڕاستی پردەکەوە ڕاگیرابوو.

**«نا، پاڵ بە ئۆتۆمبێلەکەتەوە دەنێین، ڕەنگە کەمێك بڕوات، بکرێت ئیستارت لێبدات.»**

**«باش دەکەن قوربان.»**

**«تکایە سوار بە کاکە.»**

ماروین سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو و چاوەڕێ بوو تا ئۆتۆمبێلی پۆلیسەکان پاڵ بە ئۆتۆمبێلەکەیەوە نێن. برێکە دەستییەکەی دادایەوە و گێڕەکەی دایە بۆش.

پۆلیسەکان لە نێوەڕاستی پردەکەوە پاڵیان بە ئۆتۆمبێلەکەوە نا.

خستیە گێڕی دوو و پێ خستە سەر بەنزینەکە و یەکسەر ئۆتۆمبێلەکە پێ بووەوە. دەستێکی بۆ ئەفسەرەکان لەقاند و دەستی بە لێخووڕین کرد.

لە پشتی سەریەوە هاتن و تا کۆتایی پردەکە و گەیشتنە سەر

جاده سەرەکییەکە چاودێرییان کرد.

جاده کرایەوە.

ئەوانیش هەروا سەیریان دەکرد. دواتر، ماروین قاوەخانەیەکی بینی، قاوەخانەی (گۆلکی شین). چووە نێو گەراجەکەیەوە و لە شوێنێك ئۆتۆمبێلەکەی پارك کرد.

ئۆتۆمبێلی پۆلیسەکان چەند مەترێك دوورتر لە پشتە سەریەوە بوو. لە نێوان ماروین و قاوەخانەکە.

ماروین دابەزی، دەرگاکەی قفڵ کرد و بەرەو لای گۆلکی شین بەڕێکەوت.

کاتێك ئۆتۆمبێلی پۆلیسەکان لە تەنیشتییەوە تێپەڕی، دووبارە بە هێواشی دەستی بۆ بەرز کردنەوە.

**«دووبارە سوپاس قوربان.»**

**«وا باشترە ئۆتۆمبێلەکەت چاك بکەیتەوە کاکە.»**

**«خەمتان نەبێت.»**

ماروین بێ ئەوەی سەیری پشتە سەری بکات، چووە نێو قاوەخانەکەوە. ڕێستۆرانتەکە جمەی دەهات. هەموو ئەو دەموچاوانە ئازاریان دەدا. تابلۆیەك سەرنجی ڕاکێشا: تکایە چاوەڕێی خزمەتگوزاری بکەن.

ماروین چاوەڕوان نەمایەوە و چووە دوای دواوە کە جێگەیەکی بەتاڵی لێ بوو و دانیشت. برسی نەبوو.

ژنە گارسۆنێکی زلە بە کراسێکی مۆرەوە بەرەو ڕووی هات. سەرێکی زۆر خڕی هەبوو و لێوەکانیشی بە سۆراوی سوور نەخشاندبوون. مێنۆیەکی درەوشاوەی دایە دەستی ماروین. پرسی:

**«حاڵتان چۆنە؟»**

«باشم، ئێوە چۆنن؟»

وەڵامی نەدایەوە. دواتر پرسی:
«قاوە بەڕێز؟»
«نا.»
«داوای خواردن دەکەن؟»
«نا، جارێ پەرداخێك شەرابم بۆ بێنن.»
«چ شەرابێك؟»
«شەرابی تایبەت باشە. شەرابی پۆرتۆتان هەیە؟»

گارسۆنەکە ڕۆیشت و ئەویش سەیری لەرەی سمتە زلەکەی کرد.
مارویـن بیری لەوە دەکردەوە کە ئەوشەو چۆڵ بوو دەگەڕێتەوە سەر پردەکە.
لە پشتە سەری مارویـنەوە دوو پیاو دانیشتبوون کە دەنگیان دەبیسترا.
«واپێدەچوو بارودۆخی (داگیر) باش بێت، وانییە؟»
«بەڵێ. (ڤانجلێز)یش خۆی هەڵکێشاوەتە سەرەوە. بیری لێ بکەوە، ڕەنگە خۆمان بگەیەنینەوە بە لیگی گرووپی یەکەم.»
«هەرایێکی گەورە دەنێتەوە، وانییە؟»

گارسۆنەکە بە شەرابەکەی مارویـنەوە گەڕایەوە. بە توندی پەرداخەکەی کێشا بەسەر مێزەکەدا و هەندێك شەرابی لێ ڕژا.
«ببوورن بەڕێز.»
«ئاساییە.»
«ئێستا داوای خواردن دەکەن؟»
«جارێ نا.»

«ئەوشەو ستەیکی پشتە مەڕی تایبەتمان هەیە.»
«نەخەیر، سوپاس.»

گارسۆنەکە قونی وەرسووڕاندەوە و ڕۆیشت. ماروین قومە شەرابێکی هەڵدا. تامی خاك و خۆڵێ دەدا.
شەرابەکە بە جۆرێك جاڵجاڵۆکەی هێنایە پێش چاوی. دواتر لە خوارەوە گوێی لە مۆسیقایەك بوو. پیاوێکی گۆرانیبێژیش دەیچڕی:

.«I don´t have to say I love you»

دواتر گوێی لە دەنگی پیاوەکانی پشتە سەری بوو.
«ئێستا شتێکت پێ دەڵێم کە باوەڕی پێ ناکەی.»
«چییە؟»
«ڕۆڵاند ڕێگان گەورەترین سەرۆککۆمار بووە کە ئەم نەتەوەیە تا ئێستا هەیبووە.»
«وازبێنە، ئەمە قسەیەکی زۆر زلە. ئێمە تا ئێستا دەنیایەك لەم سەرۆککۆمارانەمان هەبُوونە.»
«بێ ڕێگان، ڕووسیەی نەفەرتی دەست بۆ هەموو دنیا درێژ دەکات، ئەوان بە دیوارەکانمان هەڵدەشاخان و دەهاتنە نێو ماڵەکانمانەوە. ڕێگان لەسەر شوێنی خۆیانی داکوتانەوە. ئەوان تێگەیشتن کە ڕێگان گاڵتەی پێ ناکرێت.»
«دەی وایە، پیاوێکی باش بوو.»
«شتێکی دیکە. لە ئاسمانەکاندا شەڕ دەست پێ دەکات. شەڕی ئێمە و ڕووسەکان. لە نێو مانگ، مەریخ و هەموو هەسارەکانی دیکە شەڕ دەست پێ دەکات.»
«خۆ ئێمە ئالای خۆمان لە سەر مانگ داکوتی.»

ماروین شەرابەکەی خواردەوە و گارسۆنەکەی بینی کە بەرەو لای لەنگەی دەهات.

**«ئێستا دەتانەوێت داوای نان بکەن بەڕێز؟»**

**«شەرابێکی دیکە تکایە!»**

**«ستەیکی پشتە مەڕی تایبەتمان هەیە...»**

**«تەنیا شەراب تکایە.»**

ماروین دووبارە گوێی لە دەنگی مۆسیقاکە بووەوە. پیاوێکی دیکە دەیچڕی:

**«I´m gonna come to your room,**

**If you don´t answer the telephone soon»**

گارسۆنەکە بە شەرابەکەیەوە گەڕایەوە. لەسەر مێزەکەی دانا.

**«بینیتان، ئەم جارەیان شەرابەکەم نەڕشت.»**

قاقایەکی تەواو دەستکردانەی لێدا.

**«دەبینن، وردە وردە کارەکەم باشتر دەبێت.»**

**« کاری ئێوە عەیبی نییە...»**

**«ناوم دیانایە.»**

**«کارەکەتان عەیبی نییە دیانا.»**

دواتر بۆ ڕاییکردنی کارەکانی دیکەی ڕۆیشت.

عەسر خێرا تێپەڕی و شەو داهات. ماروین قوومێکی دیکەی لە شەرابەکەی دا. کە باران دەبارییە سەر سەقفەکە، وەك ئەوە وابوو کەرپووچ ببارێت.

جیاوازییەکەی ئەوە بوو کە پیایدا ئاوێکی سەرد دەچۆڕایە خوارەوە، بە پێیەکی بەملا و پێیەکەی دیکەی بەلاکەی دیکە و فڕێک کە ڕووەوە سەرەوە ببوونە شیش.

پێڵاوی پێوپێ لە پێ بوو. لێی ڕزگاربوو. سفر کەم سفر. لە باشترین دۆخدا، لێرەوە تا هیچ کوێ. لەمە باشتر نەدەبوو. خۆ ناکرێت هەموو شتێکت پێکەوە هەبێت.

لە ناکاو دەنگێک هات. دەنگی شکانی شووشە. دەرگاکە بە پێلەقەیەک کرایەوە و دوو پیاو کە گۆرەوییان کردبووە ماسک، هاتنە ژوورەوە. ژنێک خەریک بوو زراوی بڕژێت. پیاوێکی کورتیلە قیڕاندی:

**«بێدەنگ بن، دەنا دەکوژرێن! گاڵتە ناکەم، ئاگادار بن، دەنا دەتانێرمە دۆزەخ!»**

هەر کامەیان گوشێکیان بە دەستەوە بوو. پیاوە باڵابەرزەکە بەرو سەندووقی پارەکە ڕۆیشت، دوگمەکەی لێدا، چەکمەجەکە کرایەوە و وردە پارەکانی کردە نێو گوشەکەوە.

هەردووکیان ڕۆڤێلڤێریان پێ بوو (دەمانچەی تۆپلی - rovelver) کە لە (مەگنۆمی ۳۵۷) دەچوو.

پیاوە کورتیلەکە قیڕاندیەوە:

**«کەس لە شوێنی خۆی نەجووڵێت.»**

مەگنۆمەکەی شێتانە بە دەوری سەری خۆیەوە سووڕاندەوە. دواتر هێنایە خوارەوە و دەوروبەری کافەکەی دەکردە نیشانە.

**«زۆر باشە، جانتای پارە و جانتاکانتان بخەنە سەر مێز! ئەڵقە، کاتژمێر! هەموو شتێک! ئەگەر کەسێک بیهەوێت فرتوفێڵێک بکات لە نێو دەچێت، گوێتان لێ بوو؟»**

دواتر یەکەیەکە سەر مێزەکان گەڕا و کەلوپەلەکانی خستنە نێو گوشەکەوە.

کاری پیاوە باڵابەرزەکە لای سەندووقەکە تەواو بوو. چاوی بە گارسۆنە قەڵەوەکە کەوت کە چەند مەتر واوەتر لە ترسان چنگی بە زەوییەکەوە گیر کردبوو. بەرەو لای ڕۆیشت و گوتی:

**«پارە درشتەکەتان لە کوێ دادەنێن. لە قاسەکە؟»**

گارسۆنە قەڵەوەکە بێ جووڵە وەستابوو. پیاوە کورتیلەکە دەورێك سووڕاندییەوە و دەمانچەکەی خستە سەر گەرووی.

**«ئەو کەللەیەت دەتەقێنمەوە. قاسەکە لە کوێیە؟»**

گارسۆنە قەڵەوەکە دەستی کردە گریان و هەنسکە هەنسك، گوتی:

**«لە نێو ناندینگەکەیە! لە بن قاپشۆرەکە!»**

**«کەس لە شوێنی خۆی نەجووڵێت!»**

پیاوە باڵابەرزەکە بەرەو لای ناندینگەکە ڕای کرد.

پیاوە کورتیلەکە، گارسۆنە تۆقیوەکەی بەرو گۆشەیەك پاڵ پێوە نا. دەستی کردە کۆکردنەوەی کەلوپەلە گرانبەهاکانی سەر مێزەکان و هەڵیڕشتنە نێو گوشەکەوە.

پیاوە باڵا بەرزەکە ڕاکە ڕاك لە ناندینگەکە گەڕایەوە.

**«پارەکانم هێنان، با بڕۆین!»**

پیاوە کورتیلەکە هەر خەریکی کۆکردنەوە بوو.

**«ئاگات لە دەرگاکە بێت! ئەگەر کەسێك هاتە ژوورەوە، تەختی کە! چاوت لە دەرگاکە بێت!»**

«واز بێنە، ئەوەندەی هەڵمانگرتووە بەسە.»
«نا، دەمەوێت ئەمانە کۆ بکەمەوە.»

چووە ئەو گۆشەیەی کە مارووین دانیشتبوو؟
«هۆی خوێڕی، جانتای پارەکەت کوا؟»

مارووین سەیری ڕووخساری پیاوە ماسکدارەکەی کرد. خۆشی ویست. هەرچەندە ڕووخساری مرۆڤەکان کەمتر ببینی، زیاتر شیاوی تەحەموولکردنن.
«من دەمەوێت جانتای پارەکەم لای خۆم بهێڵمەوە.»
«ئەو گوانە نەخۆی.»
«هەر ئەوەی کە گوتم.»
«دەی جوانکیلە، کەوایە سەرت لە لەشت زیادەیە.»

مارووین هەستی بە ساردی مەگنۆمەکە لەسەر سەری کرد.
«ئێستا جانتاکەت دەردەهێنی، باشە؟»
«نا، پێویستم بە جانتاکەمە.»

پیاوە باڵابەرزەکە هاواری کرد:
«هۆی، ڕاکە با بڕۆین!»

پیاوە کورتیلەکە مەگنۆمەکەی توندتر بەسەر سەری مارووینەوە نا.
«دەتەوێت فاتیحەت بخوێنی؟»

مارووین گوتی:

**«مەوەستە، بیتەقێنە!»**

ماروێن چاوەڕێ مایەوە. زامنی دەمانچەکە چووە دواوە. ماروێن بینی کە پیاوە کورتیلەکە دەستی لەسەر لوولەی مەگنۆمەکە جێگۆڕکێ پێ کرد. بینی دەمانچەکە بەرز بووەوە. دانیشتبوو و چاوەڕێی دەکرد. دەمانچەکە دای لە نێوەڕاستی سەری. درەوشانەوەیەك لە ڕووناکی زەرد، شین و سوور بە سەریدا بڵاو بووەوە، بەڵام هەستی بە ئازار نەکرد. بۆ دەمێك نەیدەتوانی بجووڵێت. دواتر هەستی کرد باشترە.

جووڵەیەکی کرد. دڕەندانە شەقێکی وەشاند و بە پێی ڕاستی کوتایە نێو زگی پیاوەکە.

**«ئاه...»**

دزەکە گوشەکەی فڕێ دا و دەستی خستە سەر شلەی ڕانی.

**«ئاه! خوا غەزەبت لێ بگرێت...»**

ماروێن گوێی لە چوونە پاشەوەی زامنەکە بوو. پیاوەکە کردیە نیشانە و ماشەکەی کێشا. گوولەکە بە ویزەویز بە بن گوێی چەپی ماروێنەوە تێپەڕی و لە بنەبانی هۆڵەکە گلۆپێکی بنمیچەکەی شکاند.

پیاوە باڵابەرزەکە قیڕاندی:

**«با لێرە بڕۆین!»**

پیاوە کورتیلەکە خۆی قیت کردەوە و تەکە تەك بە مەنگۆم و گوشەکەیەوە، بە دوای پیاوە باڵابەرزەکە بەرەو دەرگاکە چووە. ڕۆیشتن..

پاش ڕۆیشتنیان، یەکسەر مشتەریەکان دەستیان کردە جووڵە و قسەکردن.
بەڕێوەبەری کافەکە کە تا ئەو دەمی لە ناندینگەکە خۆی شاردبووەوە، تەلەفۆنی دەکرد.
ماروین بنی پەرداخەکەی هەڵدا و سەیری گارسۆنە قەڵەوەکە کرد کە چەند مەترێك واوەتر دەلەرزی. هەستا و بەرەو لای چوو.
**«دیانا، تکایە پەرداخێکی دیکە شەرابم بۆ بێنە.»**

گارسۆنەکە گوتی:
**«وای، بەڵێ، بە دڵنیاییەوە.»**

ماروین گەڕایەوە سەر جێگەکەی و دانیشت. دەنگی میوانەکان کە باسی دزینەکەیان دەکرد، وردە وردە وەك نەخۆشییەکی لێهات.
ماروین چاوەڕێ بوو تا دیانا بە پەرداخێك شەرابەوە گەڕایەوە.
**«سوپاس دیانا.»**

قوومێکی خواردەوە.
**«زۆر بوێر بوون بەڕێز. بەم کارەتان زۆرێکتان لە شەڕی دزەکان ڕزگار کرد.»**
**«بەڵێ، وایە.»**
**«خوێناوی بووی، توخوا.»**
**«قەیناکا.»**

دیانا بەو خێراییەی کە دەلوا، ڕایکرد. (دەنینگ)، ویقەویقی ئۆتۆمبێلی پۆلیس کەوتە بەر گوێ.
دەستەسڕێکی هەڵگرت و لەسەر سەری دانا. پاشان دایگرت و

سەیری کرد. خوێن. سادەییەکی گەلحۆیانەی خوێن.

دیانا گەڕایەوە.
**«تەنیا ئەم پەڕۆ کۆنەی قاپشۆرەکەم دۆزییەوە، بەڵام خاوێنە.»**
**«سوپاس.»**

کۆنەکەی قەد کرد و لەبەر دڵی دیانا بەسەریەوە گرت.
**«دەبێت بیدووریتەوە.»**
**«باش دەبێت. لەمە گرنگتر، ئەو (ستەیك)ـەی کە باست دەکرد. لەگەڵ کەمێك پەتاتەی سوورەوکراو بۆم بێنە.»**

دیانا چووە ناندینگەکە و ئەویش شەرابی بنی پەیکەکەی هەڵقووڕاند.
خوولەکێك دواتر، پۆلیسەکان گەیشتنە جێ. ئەوان ڕاکە ڕاك بە دەست لەسەر چەرمی دەمانچەدانەکانیانەوە هاتنە ژووری.
**«کەس لە شوێنی خۆی نەجووڵێت!»**

یەکێك لەوان، هەمان ئەو ئەفسەرە دەموچاوە لەڕە سپیکەلەیە بوو، هەمان ئەو کەسەی کە لەسەر پردەکەوە پێشی (دەنینگ)ی گرتبوو.
چاویان کەوتە سەر یەکتری. ڕووخسارە لەڕە سپیکەلەکە ورما.
**«لێرە چ دەکەی؟»**
**«چاوەڕوانی ستەیکم. ئێوە منتان تا ئێرە هاوڕایی کرد. لەبیرتانە؟»**

دوو پاسەوانەکەی دیکەیش هاتنە ژوورەوە.
**«چاوەڕوانی ستەیك.»**
**«بەڵێ، نایاساییە؟»**

یەکێک لە موشتەریەکان لە نێزیکیانەوە وەستابوو، گوتی:
**«قوربان، ئەم بەڕێزە یەکێک لە دزەکانی گرتبوو. بە شەق تەختی ئەرزەکەی کرد.»**

دیانا بە ستەیك و پەتاتەی سووره‌وکراو گەڕایەوە و لەسەر مێزەکەی دانا.
گوتی:
**«قوربان، ئەم بەڕێزە زۆر ئازایە.»**

یەکێک لە موشتەرییەکان دەستی کرد بە چەپڵەلێدان. ئەوانی دیکەیش چەپلەیان لێدا.
دنینگ، پەیکەکەی بۆیان بەرز کردەوە و هەڵیدا.
پاسەوانە لەڕە سپیکەڵەکە پرسی:
**«دەزەکان دەناسیتەوە؟»**
**«ناکرێت بڵێم بە چاکی دەیانناسمەوە.»**

دواتر (دەنگینگ) دەنگی ویقەویقی دیکەی بیست. مشتەریەکان لە دەوری گلێر بوونەوە.
پاسەوانەکە بە تووڕەییەوە گوتی:
**«بگەڕێنە دواوە!»**

پیاوێکی چوارشانە، قەدوگیپاڵ گەلحۆیانە بە ڕووخسارێکی ڕیشنەوە لە دەرگاکە هاتە ژوورەوە و پاسەوانێکی دیکەیش بەدوایدا.
پیاوە چوار شانەکە لە نێوان قەرەباڵغیەکەدا ڕێگەی خۆی بۆ سەر مێزەکەی دنینگ ـ پاشناوی مارویـن بوو ـ کردەوە.

«لێرە چ باسە؟»

بەڕێوەبەرەکە گوتی:
«تاڵان کراوم. تیرەیان بڕی.»
«ئێوە؟»
«ڕیچارد فرتس، بەڕێوەبەی گۆلکی شین.»

پیاوە چوار شانەکە پێناسەکەی هێنایە دەرەوە و گوتی:
«مارێش هۆچکین، لە یەکەی هێل ساید.»

دواتر سەیری دنینگی کرد. مارێش، پێنووس و دەفتەرەکەی هێنایە دەرەوە؟
«ئێوە کێن؟»
«ماروین دنینگ، موشتەری.»

دیانا گوتی:
«ئەم بەڕێزە، یەکێك لە دزەکانی خستە سەر ئەرزەکە.»

پیاوە چوارشانەکە لە دنینگی پرسی:
«ڕاستە؟»
«بەڵێ، بە پێلەقە کێشام بە هێلکە گونیدا.»
«بۆچی؟»
«دەبوو لە شوێنی هەستیارتری بدەم؟!»
«شێوەی چۆن بوو؟»
«لە پیاوێك دەچوو کە ماسکی لەسەر بێت.»
«باڵای؟»

«بەلانی کەمەوە (١٧٠ تا ١٩٠) سانتیمەتر.»
«کێش؟»
«نزیکەی (٨٠) کیلۆ.»
«نیشانەی دیار؟»
«مەبەستتان چییە؟»
«دیارترین نیشانە کە لێی بینیت؟»
«(مەگنۆمێکی ٣٥٧)ی هەبوو.»

پیاوە چوارشانەکە هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەری دایەوە:
«شتێك لە تۆدا هەیە کە ئازارم دەدا دنینگ.»
«عەیبی نییە هۆچکین. هەروەها لە تۆشدا هەیە کە ئازاری منیش دەدا.»
«زۆر باشە، هەر لێرە بمێنەوە.»

دەستی کرد بە لێپرسینەوە لە بەڕێوەبەری گۆلکی شین.
دیانا سەیری دنینگی کرد.
«کێشە نییە دانیشم؟ ئەم ڕووداوە کوشتمی.»
بە دڵنیاییەوە، فەرموون.»

دنینگ بینی کە بنەقوونی لەسەر مێزەکە دانا، هەموو مێز و کورسییەکانی ئەو گۆشەیە لەرییەوە.
گوتی:
«تۆ بوێری، پیاوێکی ئازای، من بینیم چیت کرد.»

دنینگ گوتی:
«زۆر باشە.»

«ڕەنگە ڕابچەنی، دەزانم سەرشێتانەیە، بەڵام حەزم لێیە کارێکت بۆ بکەم. ڕانەچڵەکی؟»

«نا.»

«دەکرێت کارێکت بۆ بکەم؟»

«بە دڵنیاییەوە.»

«پاش ئەوەی کە ئەم کارەساتە تەواو بوو، با بچین بۆ ماڵەکەم. ئەم ستەیکەیش مەخۆ، شتێکی باشترت بۆ دروست دەکەم. هەست ناکەی زۆر بێ چاوو ڕووم؟»

«نا.»

دیانا بە پێکەنینەوە گوتی:

«دەزانی، کاتێك چەکەکەی خستە سەر سەرم، هەستم کرد دەمرم، بێ ئەوەی قەت پیاوێك لە ژیانمدا بووبێت، تۆقێنەر نییە؟»

«دەی جاری وایە ئەو شتانە ڕوو دەدەن.»

«دەزانم قەڵەوم و شەرم...»

«عەیبی نییە.»

«دەبێت شەرابێکی دیکەت بۆ تێبکەم.»

«بۆ وەستاوی؟»

دیانا بە زەحمەت هەستا و بەرەو نادینگەکە چوو.

لە تاریکایی ماڵەکەی دیانا، دەستیان پێ کرد.

دنینگ لە سەردەمی کارەکەی لە کۆمپانیایەکی بیناسازی

هەروەها هەر لە کاتی تەواوبوونی ئامادەیی تا دەستپێکردنی چوونە زانکۆ، بەم گەرموگوڕییە گانی نەکردبوو.
دیانا ئاهەهـ و ناڵەی دەکرد.
ئەو بە تکاوە گوتی:
**«توخوا هێور بە.»**

دنینگ بەلانی کەمەوە بۆ ماوەی چوار خوولەکی تر درێژەی بە گانەکەی دا. بەردەوام خەیاڵ یەك لە دوای یەك بە مێشکیدا دەهاتن و دەچوون.
دواجار خلۆر بووە خوارەوە، ئارەقەی کردبوو و خێرا خێرا هەناسەی دەکێشا. برینەکەی سەری دەمی کردبووەوە و هەستی کرد کە خوێن بە پشت گەردەنیدا دەچۆڕێتە خوارەوە.
دیانا گوتی:
**«ماروین! خۆشم دەوێیت.»**
**«سوپاس دیانا.»**

بەرەو حەمامەکە ڕۆیشت. خاولییەکی نیوە تەڕ کرد، گەڵوگوونی پێ خاوێن کردەوە، پاشان بە لایە وشکەکەی، خوێنی پشت گەردەنی پاك کردەوە.
زۆرێك لە پیاوەکان بێ ئەوەی سەرجێیی لەگەڵ کچێکی پەردەدار بکەن، دەمرن. ئەو نەیدەویست یەکێك بێت لەو پیاوانە.
خاولیەکەی فڕێدایە سەر ئەرزەکە و لە حەمامەکە هاتە دەرەوە. بە تەنیشت ژووری خەوتنەکە تێپەڕی و چووە ناندينگەکە. لە بەلۆعەی ئاوەکە پەرداخێکی بۆ خۆی تێکرد و خواردی.
سەیری دەوروبەری خۆی کرد. دیاناماڵێکی جوانی هەبوو. ڕەنگە لە ڕووی دڵسۆزییەوە دنیایەك شاگردانەی وەرگرتبێت.

لە نێو سەلاجەکە قتوویەکی بیرەی دۆزیەوە. هەڵی پچڕی و لە پشت مێزی ناندینگەکە دانیشت، قوومێکی هەڵدا و لە پاکەتێکی سەر مێزەکە جگەرەیەکی داگیرساند. بیرە و جگەرەکەی تەواو کرد و پاشان گەڕایەوە ژووری خەوتنەکە.

دیانا چووبووە نێو حەمامەکەوە. دواتر دەرگاکە کرایەوە و بە جلی خەوتنەوە هاتە دەرێ. بینی کە ماروین خەریکی جلپۆشینە، خۆشی لە ڕووخساری پەڕی.

**«وای، دەتەوێت بڕۆی؟»**

**«بەڵێ.»**

**«دووبارە دەتبینمەوە؟»**

**«نا.»**

**«وای، خوایا...»**

هێواش بەرەو تەختی نووستنەکە ڕۆیشت و لەسەر لێوارەکەی دانیشت. پشتی لە ماروین بوو.

هەر بەو جۆرەی کە دانیشتبوو، زۆر زل دەکەوتە پێش چاو. گڵۆپی ژووری خەوتنەکە کوژابووەوە و تەنیا ڕووناکی حەمامەکە بوو کە لە لابەلای دەرگا نیوەکراوەکەوە ئەوێی ڕووناك دەکردەوە.

دنینگ لەسەر کورسییەك دانیشتبوو و پەتی پێڵاوەکەی دەبەست. وێنای پردەکە لە نێو زەینیدا هەڵکۆڵدرابوو. پردەکە بانگی دەکرد. جارێکی دیکە بانگی کردەوە. ئاو، وەك موقناتیس بەرەو لای خۆی ڕایدەکێشا.

دنینگ پەتی پێڵاوەکەی بەست و هەستا.

**«خواحافیز دیانا.»**

ئەو وەڵامی نەدایەوە. بێدەنگ دانیشتبوو. دنینگ بینی کە

دەلەرزێت. زۆر هێواش دەگریا و هەوڵی دەدا بەری گریانەکەی بگرێت.
کەمێک شەهەوەتاوی بوو. دیانا سەری شۆڕ کردبووەوە. سەیرکردنی دنینگ وەك ئەوە وابوو کە خەریکی سەیرکردنی لاشە زلە بێ سەرەکەی بێت.
دواى وەستانێکی درێژ، پرسی:
**«بنۆڕە، ئەرێ شتێکت بۆ خواردن دەست دەکەوێت؟»**
**«چی؟»**
**«پرسیم شتێکت هەیە بۆ خواردن؟»**

سەری وەرسووڕاند.
**«ئاە بەڵێ مارووین، بتڵە شەرابێکم هەیە و دوو دانە ستەیک و سەوزی.»**
**دنینگ پرسی:**
**«دەکرێت نانی ئێوارە بخۆین؟»**

دیانا وەها لەسەر تەختەکەی دەرپەڕی کە وەك بڵەی زۆر سووکەڵە بێت. زۆر سەیر بوو. دواتر بەرەو ناندینگەکە ڕۆیشت.
دنینگ کۆتەکەی دەرهێنا و لەسەر کورسییەکەی دانا. پێڵاوەکانی لەپێ کردنەوە، گۆرەوییەکانی، پانتۆڵەکەی و کاتێک دیانا هەڵگەڕایەوە هێشتا شۆرت و ژێرکراسەکەی لەبەر بوو.
دیانا بە بتڵێک شەراب و دوو پەرداخ و سەرهەڵکەنەکەیەوە هاتە ژوورێ. هەڵگرتنی هەموو ئەمانە کەمێک قورس بوو، بەڵام پێدەکەنی، نەك زۆر بڵیند، بەڵکو پێکەنینێکی ئارام، شێتانە، نەپچڕاو و بەو پەڕی خۆشییەوە.
ئەو ڕووناکییەی کە بە لای دەرگا دادڕاوی حەمامەکەوە دەزایە ژوورێ.



بتڵێک شەراب و سەرهەڵکە
لەشی، ڕووخساری، دوو پەرداخ،
خستە چوارچێوەیەکەوە.

لەو (٤٦) ساڵییەدا ژنێکی بە
پێش لەوە، هەرگیز مارویـن دنینگ
جوانییە نەدیتبوو.

***

# (The Suicide ـ بێگۆڕەوی)

## پێشەکی و باسێکی کورت لە وەرگێڕ:

(چیرۆکەکانی شێتایەتییە باوەکان ـ Tales of Ordinary madness)، پەرتووکێکە لە کۆمەڵە دوو بەرگییەکەی چیرۆکە کورتەکانی بۆکۆفسکی کە دەزگای (سیتی لایت) بۆ یەکەم جار و لە ساڵی (١٩٨٣) چاپی کردن.
ئەم کۆمەڵە دوو بەرگییە، گوڵچینێکە لە کۆمەڵەیەك بە ناونیشانی (Ejaculations, Exhibitions, and General Tales of Ordinary Madness) کە لە ساڵی (١٩٧٢) چاپ و بڵاو بووەوە.
بەرگی دووەمی ئەم کۆمەڵەیە (جوانترین ژنانی شار ـ The most beautiful woman in town)ـە. ئەم کۆمەڵەیە تێکهەڵکێشێکی زیرەکانەیە لە فەرهەنگی باڵادەستان و

بندەستان.

بۆکۆفسکی، سوودی لە فەرهەنگی ژنانی لەشفرۆش و فەلسەفەی کانت و بێهیوایی فەلسەفی و مۆسیقا وەرگرتووە تا بنەمای مۆدێرنی خۆی بخولقێنێت.

بۆکۆفسکی بە ئیلهاموەرگرتن لە نووسەرانی وەك (دەی. ئیچ. لارێنس)، (چیخۆف)، و (هەمینگوای) شێوازێکی داهێناوە گەرموگوڕ، لادەرانە و بێڕەحمانەی واقیعگەرایانەیە. (نیۆیۆرك تایمز) لە کاتی چاپی کۆمەڵەی (چیرۆکەکانی شێتایەتییە باوەکان)، لە ڕەخنەیەکیدا نووسیویەتی: «لە پاش (جۆرج ئۆرول)ـەوە، بارودۆخی ژیانی بندەستان بەم باشییەی ئێستا تۆمار نەکراوە.»

هەر ئەوکات، ڕەخنەیەکی دیکە لە سەر ئەم کتێبە نووسرا: «ڕیالیزمی پیس لە زڕباوکێکی ئەدەبیاتی بندەستانەوە».

شایانی باسە ئەم کۆمەڵەیە (٣٣) چیرۆك لە خۆ دەگرێت و (مارکۆی فێرفڕی)ـی فیلمسازی ئیتالی لە ساڵی (١٩٨١) فیلمێکی لەسەر بەرهەم هێناوە بە هەمان ناونیشان کە (بێن گازارا) بەشداری تێدا کردووە.

(بێگۆرەویی یەکێکە لە کورتە چیرۆکەکانی ئەم کۆمەڵەیە.)

***

که ئەو خەریکی مژینی کێرم بوو، (بارنی)ـیش لە پشتەوە کێری ئاخەنیبووە قوونیەوە. سەرەتا (بارنی) ڕەحەت بوو و پاشان پەنجەی خستە قوونیەوە و هەڵیسووڕاند.
پرسی:
**«حەزت لێیە؟»**

ئەو، لەوکاتەدا وەڵامی پێ نەدرایەوە. لە مژین تەواو بوو. دواتر نزیکەی سەعاتێك مەشرووبمان خواردەوە. پاشان چوومەوە زگ قوونی. بارنیش دە دەمی نا.
دواتر بارنی چووەوە بۆماڵەوەی، منیش چوومەوە بۆ ماڵەکەی خۆم. هێندەم خواردەوە تا خەوم لێ کەوت.
وەك بڵەی سەعات چوار و نیوی پاش نێوەڕۆ بوو، جەڕەسی دەرگاکە لێدرا. بەردەوام ئەو کاتانەی کە نەخۆش بووم یا پێویستم بە خەو بوو، سەرومۆقلی دەردەکەوت.

(دان)، ڕووناکبیرێکی کۆمۆنیست بوو کە ناوەندێکی شیعری بەڕێوە دەبرد، لە مۆسیقای کلاسیك سەری دەردەکرد، ڕیشێکی تەنکی هەبوو و بەردەوام لە نێو قسەکانیدا گاڵتەی بێتامی دەکرد و لەمەیش خراپتر، شیعری وەزن و قافیەداریشی دەنووسی.

سەیرم کرد، گوتم:
**«نەفرەتی.»**
**«دووبارە نەخۆشی بۆك؟ ئاە بۆك، نەڕشێیەوە!»**

ڕاستی دەگوت. ڕامکردە نێو ئاودەستەکەوە و ڕشامەوە.
کاتێك گەڕامەوە، لەسەر قەنەفەکەم دانیشتبوو، ساغڵەم...

پرسیم:
**«دەی؟»**
**«بۆ شیعرخوێندنەوەکانی بەهار پێویستمان بە چەند شیعرێکت هەیە.»**

قەت خۆم لەم شیعرخوێندنەوە و کۆڕە شیعریانە نیشان نەدابوو و حەزێکیشم لێیان نەبوو، بەڵام ئەو هەموو ساڵێك وەدەردەکەوت و من نەمدەزانی چۆن بە ڕێزەوە ڕەتی بکەمەوە.

**«من شیعرم نییە، دان.»**
**«تۆ بەردەوام گەنجینەکەت پڕ لە شیعرە.»**
**«دەزانم.»**
**«کێشە نییە سەیرێکی گەنجینەکەت بکەم؟»**
**«دەی تەماشایکە.»**

بەرەو سەلاجەکە چووم و بە بیرەیەکەوە گەڕامەوە. دان بە چەند کاغەزی گلۆفدراو و مەچۆڵەکراو دانیشتبوو.
**«بنۆڕە، ئەم دانەیان خراپ نییە. هاااا، ئاە ئەمەیان گوووە! و ئەمەیش هەر گووە. و ئەمەیشیان هەروا. هاهاهاهـا! چیت لێ هاتووە، بۆکۆفسکی؟»**
**«نازانم.»**
**«ئەها.. ئەم دانەیان زۆر خراپە. ئۆی، ئەم دانەشیان گووە! و ئەمەیش!»**

نازانم ئەو کاتەی لەبارەی شیعرەکانمەوە قسەی دەکرد، چەند بیرەم خواردەوە. خەریك بوو حاڵم باشتر دەبوو.

«ئەم دانەیان...»
«دان؟»
«بەڵێ، بەڵێ؟»
«ق.و.ز پێدەزانی؟»
«چی؟»
«ژنێک ناناسی کە پاڵ کەوتبێت و لەبەر (١٠ تا ١٢) سانتیمەتر بکەوێتە هانکە هانک؟»
«ئەم شیعرانە...»
«لەبابی شیعرەکان بم! قوز براکەم، قوزا!»
«ڕاستییەکەی، (وەرا)یەک هەیە کە...»
«یەڵا با بڕۆین!»
«حەزم لێیە چەند دانەیەک لەم شیعرانە هەڵگرم؟»
«بیانبە، تا من جلەکانم لەبەر دەکەم، بیرەیەک ناخۆیتەوە؟»
«دەی، دانەیەک خۆ زەرەری نییە.»

بیرەیەکم دایێ و کۆتەخەوەکەم (ڕووبدوشامبر - کراسێکی گەورە و بەرتاک کە لە ماڵدا بەسەر بەرگی خەو لەبەر دەکرێت. - فەرهەنگی زانکۆی کوردستان) داکەند و جلە دڕاوەکانم لەبەر کرد.
چ قەدوگیپاڵێک! جووتێک پێڵاو، دەرپێی کوون کوون، زنجیری پانتۆڵێک کە تەنیا سێ لەسەر چواری هەڵدەپێکرا. لە دەرگاکە وەدەرکەوتین، چووینە نێو ئۆتۆمبێلەوە. بۆ نیوە ویسکییەک ڕامگرت.

دان گوتی:
«من قەت نەمبینوە تۆ نان بخۆی، قەت نان دەخۆی؟»

«تەنیا هەندێك شت.»

ئەو ڕێی ماڵی (وەرا)ی نیشان دام. دابەزین. نیوە ویسکییەك و
من و دان. زەنگی دەرگای شووقەیەکی بەشکۆمان لێدا.

وەرا دەرگاکەی کردەوە.

«ئاه، سڵاو دان.»

«وەرا.. ئەمە چارلز بۆکۆفسکییە.»

«ئۆی، من هەمووده‌م دەمویست بزانم چارلز بۆکۆفسکی چۆنە.»

«بەڵێ، منیش هەروەها.»

بە پێشیدا تێپەڕیم و چوومە ژوورەوە.

«پەرداخت هەیە؟»

«ئۆی. ئەی چۆن.»

وەرا پەرداخەکانی هێنا. کوڕێکیش لەسەر قەنەفەکەی ماڵی وەرا دانیشتبوو. دوو پەرداخم پڕ لە ویسکی کرد، یەکیانم دایە وەرا، ئەویتریشیانم خۆم هەڵمگرت. پاشان لەسەر قەنەفەکە و لە نێوان وەرا و ئەو کوڕەی کە لەوێ دانیشتبوو، پاڵم دایەوە. دانیش لە نێوەڕاستی ڕێگاکە دانیشتبوو.

وەرا گوتی:

«بەڕێز بۆکۆفسکی، من شیعرەکانتانم خوێندوەتەوە و...»

گوتم:

«پەیکەکەت هەڵدە با بچین بۆ شیعر.»

وەرا گوتی:

**«ئۆوووو.»**

ویسکییەکەم هەمووی نا بە سەرمەوە، خوار بوومەوە و جلەکەی وەرام تا سەر ئەژنۆکانی هەڵدایەوە. پێم گوت:

**«پەلوپووزێکی جوانت هەیە.»**

گوتی:

**«وابزانم کەمێك قەڵەو بوومە.»**

**«ئۆی نا! زۆریش باشی!»**

پەرداخێکی دیکەم بۆ خۆم تێکرد، چەمامەوە یەکێك لە ئەژنۆکانیم ماچ کرد. قومێکی بچووکم خواردەوە و دواتر کەمێك سەرووی ئەژنۆیم ماچ کرد.

ئەو کوڕەی کە لە گۆشەکەی دیکەی قەنەفەکەوە دانیشتبوو، گوتی:

**«ئۆی نەفرەتی، ئیتر من دەڕۆم!»**

هەستا و چووە دەرەوە.

ماچکردنەکانم لەگەڵ قسەی پووچ تێکەڵ کردن. پەرداخەکەیم دووبارە پڕ کردەوە. زۆر زوو جلەکەیم تا سەرەوی قوونی هەڵدایەوە.

مایۆکەیم بینی. مایۆیەکی دڵتەقێن بوو. لەو مایۆ و دەرپێ ئاساییانە نەبوو، زیاتر لەو ڕووکەشە کوون کوونە کلاسیکیانە دەچوو بە چوارگۆشەی بەرزی دیار لە جنسی ئاوریشم، ڕێك

وەك ئەوەی کە لە پێخەفی مینیاتۆری دروست کرابێت - و ڕەنگە دڵگیر و شینەکانی سەوز و شین و زێڕین و زەرد.

سەرم لە نێو لینگەکانی هەڵێنایەوە و دانیش داچەپیو لە بەرامبەرماندا دانیشتبوو. گوتم:
**«دان، کوڕم، وابزانم کاتی ئەوەیە بڕۆی.»**

دان، بە ڕەقەوە چاوی لەسەر ئەو شانۆگەرییە سێکسییەی کە دواتر بۆ دەسپەڕ زۆر باش بوو وەرگێڕا، بەڵام هەر چۆنێك بێت وا پێدەچوو ڕۆیشتن بۆ ئەو کارێکی دژوار بێت. بۆ منیش سەخت بوو.. دەی..
ساف دانیشتم و مەشرووبێکی دیکەم تێکرد. وەرا چاوەڕوان بوو. بە هێواشی خواردمەوە.

وەرا گوتی:
**«چارلز.»**

گوتم:
**«سەیرکە، من مەشرووبەکەمم خۆش دەوێت، بەڵام خەم مەخۆ، ئێستا دێمە زگت.»**

وەرا بە جلێکی هەڵماڵدراوەوە تا سەر قوونی، چاوەڕوان دانیشتبوو. گوتی:
**«من زۆر قەڵەوم، بەڕاستی، تۆ وا بیر ناکەیتەوە؟»**
**«ئۆو، نا، زۆر باشی. دەتوانم سێ ساعەت بتگێیم. تەنیا کەمێك خۆش گۆشتی. دەتوانم بۆ هەمیشە لە ناوتدا بتوێمەوە.»**

مەشرووبەکەم هەڵدا، دانەیەکی دیکەم تێ کرد.
گوتی:
**«چارلز.»**
گوتم:
**«وەرا.»**
پرسی:
**«چییە؟»**
پێم گوت:
**«من گەورەترین شاعیری دنیام.»**
پرسی:
**«زیندوو یا مردوو؟»**
گوتم:
**«مردوو.»**

دەستم برد و دە یەکێك لە مەمکەکانیم گیراند.
**«حەزم لێیە ماسییەك زیندوو زیندوو باخنمە قوونتەوە، وەرا!»**
**«بۆچی؟»**
**«لەعنەتی، نازانم.»**

جلەکانی هێنایە خوارەوە. منیش بنە پەرداخە ویسکییەکەم هەڵقوراند.
«بە قوزت میز دەکەی، وانییە؟»
**«وابزانم.»**
**«لە ڕاستیدا، کێشەی ئێوە ژنان هەر ئەوەیە.»**
**«چارلز، شەرمەزارم، بەڵام دەبێت داوات لێ بکەم بڕۆی. سبەی**

**دەبێت زوو بچمە سەر ئیش.»**
**«کار، بار، بێ ئیش دانیشتووە لە بن سێبەری دیوار.»**

گوتی:
**«چارلز، تکایە برۆ.»**
**«تکایە نیگەران مەبە. ئێستا ڕێت دەخەم! بەڵام سەرەتاکەی دەمەوێت کەمێك مەشرووب بخۆمەوە. من پیاوێکم کە مەشرووبی زۆر خۆش دەوێت.»**

دیتم هەستا. لەبیرم کرد. مەشرووبێکی دیکەم تێکرد. دواتر سەرم هەڵێنا. وەرا و ژنێکی دیکە لەوێ بوون.
ژنەکەی دیکەیش جوان بوو.

ژنەکە گوتی:
**«کاکە، من هاوڕێی وەرام. ئێوە ترساندووتانە و لەگەڵ ئەوەیشدا دەبێت بەیانی زوو لە خەو هەڵسێت. ناچارم داواتان لێ بکەم کە لێرە بڕۆن!»**

**«گوێ گرە، پیرەقۆتڕ، هەردووکتان دەگێیم، بەڵێن دەدەم! تەنیا ڕێگە بدەن چەند پەرداخی دیکە بخۆمەوە، ئەمە هەموو ئەو شتەیە کە من دەمەوێت! شتێکی بیست سانتیمەتری چاوەڕوانی هەردووکتانە!»**
ئیتر خەریك بوو دەگەیشتمە بنی نیوە بتڵەکەوە کە دوو پاسەوان هاتنە ژوورەوە. لەسەر قەنەفەکە بە شۆرتەوە دانیشتبووم و پانتۆڵ و گۆرەوییەکانم داکەندبوون.
تەواو خۆش ببووم. شووقەیەکی زۆر جوان بوو.

پرسیم:
**«بەڕێـزان؟ لـە کۆمیتەی نۆبێڵ هاتوون؟ یا لە پۆلیتزەر؟»**

یەکێکیان گوتی:
**«پێڵاو و پانتۆڵەکـەت لەبەر کەوە، خێرا!»**

پرسیم:
**«بەڕێـزان ئـاگاداری ئـەوەن کـە قسـە لەگـەڵ چارلـز بۆکۆفسـکی دەکـەن؟»**
**«لـە بەڕێوەبەرایەتـی پۆلیـس پێناسـەکەت دەبینیـن. ئێسـتا پانتـۆڵ و پێڵاوەکـەت لەپـێ بکـە.»**

وەك هەمیشـە تونـد دەسـتمیان لـە پشـتەوە کەلەپچـە کـرد، بـە شـێوەیەك کـە جـێ ڕووشـاوییە چکۆلەکانـی سـەر کەلەپچەکـە ڕۆدەچوونـە نێـو ڕەگەکانـی دەسـتمەوە. دواتـر خێـرا خێـرا پاڵیـان پێـوە نـام بـۆ دەرەوە و لـە جادەیەکـی سـەرەوهەڵدێر زیاتـر لـەوەی کـە لـە توانـای قاچەکانمـدا بێـت، دەیانهاژووشـتم.
هەسـتم دەکـرد بـە شـێوەیەکی سـەیر هەمـوو دنیـا خەریکـی سـەیرکردنمن، تـەواو لـە شـتێك شـەرمەزار بـووم. تاوانبـار، بەدەبەخـت، کەموکـورت، وەك میـز، وەك قاپـۆڕی گوللـەی ڕەشـاش.

یەکیان پرسی:
**«تـۆ ژنبازێکی گەورەی، وانییە؟»**

هەسـتم کـرد ئـەم قسـەیەی تـەواو هاوڕێیانـە بـوو، بـەڵام بـە تێبینییەکـی مرۆڤانـەوە. گوتـم:

**«شووقەیەکی جوانکیلە بوو.. ئاخ بەس مایۆکەیت بینیبا!»**

پاسەوانەکەی دیکە گوتی:
**«دەمت قەپات کە!»**

بێ گوێدان منیان دە پشتەوە ئاخنی. خۆم لێک کێشایەوە و گوێم هەڵخست بۆ ڕادیۆ کەشخە، سادە و یەزدانییەکەیان.
هەمموودەم لەو کاتانەدا بیرم لەوە دەکردەوە کە بارودۆخی پاسەوانەکان لە من باشترە، بەڵام لەم تێهزرینەدا حەقیقەتێک خۆی مەڵاس دابوو...
لە بنکەی پۆلیس ـ وەك هەمیشە وێنەگرتن و دەستبەسەرداگرتنی کەلووپەلەکانی گیرفان ـ هەموو شتێك دەگۆڕا، مۆدێرن دەبوو، دواتر کەسێك لە جلێکی مەدەنیدا.
دواتریش پەنجەمۆرکردنی دژوار کە من هەمموودەم کێشەم لەگەڵ پەنجە گەورەمدا هەبوو:
**«ئاسوودە، نهۆ، ئاسوودە!»..**

هەمموودەم ئەم هەڵەیەم بە تێوەگلانی پەنجە گەورەمەوە بەسەر دەبرد، بەڵام لە نێو زیندان چلۆن دەکرێت ئاسوودە بیت؟
پاسەوانێك لە جلێکی مەدەنی و لە ڕووی کاغەزێکی سەوزی هێڵدارەوە دنیایەك پرسیاری خوێندنەوە. بزەیەکی بەسەر لێوەوە بوو.
بە هێواشییەوە گوتی:
**«ئەو پیاوانەی دیکە حەیوانن. خۆشم لێت هات، کاتێک چوویتە دەرەوە تەلەفۆنم بۆ بکە.»**

پارچە نووسینێکی دایە دەستم. گوتی:

**«ئەوان حەیوانن. ئاگادار بە.»**

بە درۆوە گوتم:

**«تەلەفۆن دەکەم.»**

وام هەست کرد ئەم درۆیە یارمەتیدەرە. کاتێک تووشی وەها شتێک دەبی، هەر سۆزێکی هاودەردانەیش بۆت شکۆدارە...

پاسەوانەکە گوتی:

**«دەتوانی تەلەفۆنێك بکەی. ئێستا بیکە.»**

ڕێگەیان دا لە بەشی مەستەکاندا بچمە دەرەوە، لەوێ هەموویان لەسەر مێز خەوتبوون، جگەرەیان بۆ یەکتری فڕێ دەدا، پڕخەیان دەهات، پێدەکەنین و میزیان دەکرد.

وا پێدەچوو مەکسیکییەکان لە هەمووان ئاسوودەترن، بە شێوەیەك کە وەك بڵەی لە نێو ژوورەکانی خەوتنی خۆیان بن. حەسوودیم بە ئاسوودەیی و بێ خەیاڵییەکەیان دەبرد.

چوومە دەرەوە و سەیری پێرستی تەلەفۆنەکانم کرد، ئەو کاتە تێگەیشتم کە هاوڕێیەکم نییە. هەروا پەڕەکانی دەفتەر تەلەفۆنەکەم هەڵدەدایەوە.

پاسەوانەکە گوتی:

**«بنۆڕە، گەرەکتە چەندە ڕاوەستێ؟ پانزە خوولەکە لێرەی.»**

بە خێرایی گومانێکم کرد و ژمارەیەکم لێدا. هەموو ئەوشتەی کە دەستم کەوت دنیایەك کەرەشاعیر بوو لە لایەن دایکی کەسێکەوە کە تەلەفۆنەکەی هەڵگرتبوو و وەڵامی دایەوە.

گوتی کە من بوومەتە هۆی ئەوەی (کوڕەکەی) بکەوێتە زیندانانەوە، چونکە بە مەستی و بە پێداگرییەوە پێم گوتبوو زۆر بەتامە مرۆڤ لەسەر سەکۆی مردووشۆرخانەی شەقامی (ئینگلۆود) ی کالیفۆرنیا بخەوێت.
پیری زۆڵ هەر لە سووعبەتیشی نەدەزانی.
پاسەوانەکە گەڕاندمیەوە.
ئەوکاتە بوو هەستم کرد من تەنیا کەسم لە زیندان کە گۆرەویم لەپێ نییە.

لەوێ لە بەشی مەستەکان، ڕەنگە (١٥٠) کەس دەستبەسەر بوون کە (١٤٩) کەسیان گۆرەوییان لە پێ بوو. هەندێکیان هەر ئەوکات لە فارگۆنەکانی پۆلیس دابەزێنرابوون. من تەنیا کەسێ بێ گۆرەوی بووم.
دەکرا ڕۆبچیتە نێو قووڵاییەکانەوە و تازە لەوێ قووڵاییەکی دیکە بدۆزیتەوە.
گوو لەناو گوو..
هەر جارەی کە پاسەوانێکم دەبینی، دەمپرسی ئیزن هەیە تەلەفۆنێك بکەم کە مافی خۆمە.
نازانم تەلەفۆنم بۆ چەند کەس کرد.
دواجار وازم هێنا و بڕیارم دا هەر لەوێ بڕزێم. دواتر دەرگای بەندییەکە کرایەوە و ناوی منیان هەڵدا.
پاسەوانەکە گوتی:
**«کەسێك بووەتە کەفیلت.»**

گوتم:
**«یا حەزرەتی مەسیح!»**

لەو دەمەی بە کەفالەت ئازادبووم کە سەعاتێك درێژەی کێشا، لە خۆم دەپرسی کە فریشتەی ڕزگارکردنم لە کوێوە هاتووە. بیرم لە هەموو کەس کردەوە. بە هەموو ئەو کەسانەی کە هاوڕێم بوون. کە چوومە دەرەوە بۆم دەرکەوت پیاوێك و ژنەکەی بوونەتە کەفیلم کە وابزانم ڕەقیان لە من دەبووەوە. ئەوان لە پێڕەوەکە چاوەڕوان بوون.

گەیاندمیانەوە ماڵەوە و لەوێ بەهای کەفالەتەکەم پێیان دا. تا بەردەمی ئۆتۆمبێلەکەیان لەگەڵیان چووم و هەرکە چوومەوە نێو ماڵەوە، دەنگی تەلەفۆنەکە زرەی هات.

دەنگی ژنێك بوو.

دەنگێکی باش.

**«بۆك؟»**

**«بەڵێ، خۆشەویستەکەم، تۆ کێیت؟ من هەر ئێستا لە زیندان ئازاد بووم.»**

تەلەفۆنێك بوو لە دوورەوە، لە ژنێکی دڕندە لە ساکرامێنتۆ، بەڵام کێرم نەدەگەیشتە ئەوێ و هێشتایش بێ گۆرەوی بووم.

**«جارجار هەموو کتێبە شیعرییەکانت دووبارە و دووبارە دەخوێنمەوە. بۆك، هەموو شیعرەکانت لە مێشکمدا دەمێننەوە، من هەمووشدەم بیرت لێ دەکەمەوە.»**

**«سووپاست دەکەم ئان، سوپاس بۆ تەلەفۆنەکەت، تۆ کچێکی شیرینی، بەڵام من دەبێت بڕۆمە دەرەوە و مەشرووب پەیدا بکەم.»**

**«عاشقتم بۆك.»**

«هەروەها منیش ئان.»

چوومە دەرەوە و بەستەیەکی شەش قووتی گەورەی بیرە و نیو بتڵ ویسکی. هەر کە یەکەم پەرداخ ویسکیم تێ کرد، تەلەفۆنەکە دووبارە زرینگایەوە. نیوەی پەرداخەکەم هەڵدا و دواتر وەڵامم دایەوە.

«بۆک؟»

«بەڵێ، بۆکە؟ هەر ئێستا لە زیندان هاتوومەتەوە.»

«بەڵێ، دەزانم. وەرام.»

«ئەی قۆترِ. تۆ بانگی پاسەوانەکانت کرد.»

«تۆ تۆقێنەر بووی. ترسناك. ئەوان لێیان پرسیم کە بە تاوانی دەستدرێژیکردنەسەرم شکایەتی لێ دەکەی، منیش پێم گوتن نا.»

دەرگاکەی قوفڵێکی زنجیری هەبوو، بەڵام لە درزێکەوە ناوەوەیم دەبینی. نیوە ویسکییەك و بەستەیەکی شەش قووتی بیرە فەرمانیان دەدا.

کۆتەخەوەکەی لەبەر بوو کە پێشەوەی کرابووەوە و یەکێك لە مەمکە شەهوانییەکانیم بینی کە زەختی بۆ خۆی دەهێنا تا بە مەبەستی مژین ئەویش بە دەمی من، لە جلەکانییەوە بێتە دەرێ.

گوتم:

«وەرا، خۆشەویستەکەم. وامزانی دەتوانین هاورِێیەکی باش بین، هاورِێی زۆر باش. دەتبوورم کە تەلەفۆنت بۆ پۆلیس کرد. رِێگە بدە بێمە ژوورەوە.»

«نا، نا، بۆك، ئێمە بە هیچ شێوەیەك ناتوانین هاورِێ بین! تۆ پیاوێکی ترسناکی.»

مەمکەکە هەروا لێم دەپاڕایەوە.

**«وەرا!»**

**نا بۆك، کەلوپەلەکانت بپێچەوە و تکایە بڕۆ، تکات لێ دەکەم!»**

جانتا و گۆرەوییەکانم دەست دایێ.

**«زۆر باشە خرە، شتێك باخەنە نێو ئەو قوونە شل و وڵەتەوە!»**

گوتی:

**«ئۆی..»**

دەرگاکەی پێوەدا.

کاتێك کە جانتاکەم بە مەبەستی دۆزینەوەی ٣٥ دۆلار هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکرد، بیستم کە (ئاروون کۆپلەنڈ) گوێ دەگرێت.

چەندەیش درۆزن!

ئەمجارەیان بێ پاسەوانیکردنی پۆلیس، ڕێگەکەم تا دەرەوە گرتەپێش. ئۆتۆمبێلەکەم کەمێك لە خوارترەوە دۆزییەوە. سوار بووم.

پێ بوو.

وەستام تا گەرم دابێت..

هاوڕێ نازەنینە کۆنەکەم.

پێڵاوەکانم لەپێ داکەند و گۆرەوییەکانم لەپێ کردن، دووبارە پێڵاوەکانم کردە پێم و جارێکی دیکە بوومەوە بە هاووڵاتییەکی نەجیب. بە گێڕی یەك لە نێو دوو ئۆتۆمبێل هاتمە دەرەوە، پێچاندمە نێو شەقامەکەوە و لە شەقامی تاریکەوە بەرەو باکووری باکووری باکوور هاژووشتم...

بە ئاراستەی خۆم،ماڵەوەم، بە ئاراستەی شتێك..

کەونە ئۆتۆمبێل بەنزینی هەبوو، دواتر خۆیشم بەنیزینم هەبوو و ڕێگەکەم دەناسییەوە و لەپشت گڵۆپی ترافیکلایتەوە جگەرەیەکی نیوەسووتاوم دۆزییەوە، پێم کرد، کوونە لووتمی سووتاند.

گڵۆپەکە ڕەنگی گۆڕی، دووکەڵەکەم هەڵمژی، دووکەڵی شینم دایەوە دەرێ. قەت، کەس لە ئەزموونکردنی چانس، شکستخواردن و گەڕانەوە بۆ هەمان شوێنی هەمیشەیی خۆی، نەمردووە.

سەیرە: هەندێك کات نەگایین باشترە لە گایین.

هەرچەندە ئەگەری ئەوە هەیە هەڵە بکەم. دەگوترێت کە من لە بنەڕەتەوە هەڵە دەکەم.

***

# (هەزار پیشە)

شووقەکەمان کەوتبووە قاتی چوارەمی باڵەخانەکەوە.

دوو ژووری ڕوو بە دواوەمان هەبوو. باڵەخانەکەیان وەها لە لێواری کەندەڵانێك دروست کردبوو کە لە پشتیەوە سەیری دەرەوەت کردبایە، وەك ئەوە بوو لە قاتی دوانزەیەمەوە بیت نەك چوارەم. وەك ئەوە بوو لەسەر لێواری دنیا وەستا بیت..

وەك دواهەمین وێستگە، بەر لە کەوتن و مردنی کۆتایی.

لەگەڵ ئەوەیشدا، خوولی بردنەوەمان لە گۆڕەپانی ئەسپسواری کۆتایی پێ هاتبوو، هەروەك چۆن هەموو خوولەکان بە دووماهی دەگەن. خەریك بوو پارەکەمان لە بن دەهات و ئێمە بە ناچاری پەنامان بردبووە بەر شەراب، پۆرت و مۆسکاتێل.

لە تەختی عەرزی نادینگەکەدا شەش حەوت گاڵۆنە شەرابمان

ڕیز کردبوون و لە پێشەوەشیان چوار پێنج دانە بتڵی ئاسایی هەبوون و لەپێشەوەی ئەوانیش سێ چوار دانە نیو بتڵی.

بە (جەین)م گوت:

«ڕۆژێك دێت ئەوە بدۆزنەوە کە دونیا چوار ڕەهەندە نەوەك سێ ڕەهەند. دواتر مرۆڤ دەتوانێت بۆ پیاسە بچێتە دەرەوە و ون بێت. نە کفن، نە فرمێسکێك، نە هیچ خەیاڵ و وەهمێك. نە بەهەشتێك و نە دۆزەخێك. بۆ نموونە هاوڕێکانی بە دەوری یەکتریيەوە خڕ بوونەتەوە و دەپرسن: (جۆرج بۆ کوێ چوو، دیار نەما؟) و یەکێکی دیکەیان دەڵێت: (ڕاستییەکەی نازانم، گوتی دەچم جگەرە بکرم).»

جەین گوتی:

«ئەرێ بەڕاست، سەعات چەندە؟ من دەمەوێت بزانم سەعات چەندە؟»

گوتم:

«بنۆڕە، ئێمە دوێشەو بەرەبەری نیوەشەو بوو کە کاتژمێرەکەمان لەگەڵ ڕادیۆکەدا میقات کردەوە. دەزانم هەموو سەعاتێك، سی و پێنج خوولەك وەپێش دەکەوێت.

ئێستا سەعات (٧:٣٠)ی دوانیوەڕۆیە، بەڵام تەواو دەزانم کە ڕاست نییە، چونکە هێشتا دنیا تاریك نەبووە. زۆر باشە.. ئەمە دەکاتە حەوت و نیو. حەوت جارانی سی و پێنج خوولەك، دەکاتە (٢٤٥) خوولەك. نیوەی (٣٥)یش دەکاتە (١٧:٥). ئەمانە هەمووی کردنیە (٢٦٢) و نیو خوولەك.

زۆر باشە، ئەم ژمارەیەیش دەکاتە چوار سەعات و (٤٢) خوولەك و ئێمە نیو خوولەك قەرزارین، کەوایە سەعاتەکە دەگەڕێنینە دواوە

بۆ (5:47) خوولەك. بەڵێ. ئێستا سەعات (5:47) خوولەکە. کاتی شیفی ئێوارەیە و هیچیشمان نییە بیخۆین.»

کاتژمێرەکەمان کەوتبووە خوارەوە و تێك و پێك شکابوو، منیش وەك بڵەی چاکم کردبووەوە.
ئاخر پشتیم کردبووەوە و کە بینیم سپرینگە گەورەکەی و لەنگەرەکەی باش ئیش ناکەن تەنیا ڕێگەیەك کە بە مێشکمدا هات بۆ چاککردنەوەی، ئەوەبوو سپرینگەکە کورتتر و تووندتر بکەمەوە تا دووبارە بکەوێتەوە ئیش.
هەر ئەمە ببووە هۆی ئەوەی کە میلەکانی خێراتر بسووڕێنەوە. بە شێوەیەك کە دەکرا جوولەی میلی خوولەك ژمێرەکە بە چاو ببینرێت.

جەین گوتی:
«وەرە گاڵۆنێك شەرابی دیکە هەڵپچڕین.»

کارێکی دیکەیشمان نەبوو، جگە لەوەی کە شەراب بخۆینەوە و خەریکی دڵداری بین.
هەرچی خواردەمەنیمان هەبوو، خواردبوومان. شەوانە دەچووینە دەرەوە بۆ پیاسە و لە سەر بۆنیتی ئۆتۆمبێلە ڕاگیراوەکان جگەرەمان بە با دەکرد.

جەین پرسی:
«دەتەوێت پان کەیکت بۆ دروست بکەم؟»

گوتم:

**«هەست ناکەم بتوانم تەنانەت یەك دانە پان کێکی دیکە بخۆم.»**

زبدە و ڕۆنەکەشمان لە بن هاتبوون، هەر لەبەر ئەوەیش بوو جەین پان کێکەکانی بە وشکی دروست دەکردن.
هەویرەکەیشی هەویری پان کێك نەبوو، ئارد بوو کە لەگەڵ ئاو تێکەڵی دەکرد. هەر لەبەر ئەوە دەبرژا، واتە بە گشتی تەواو تەواو دەبرژا.
هەروا کە خەریکی بیرکردنەوە بووم، بە دەنگی بەرز لەخۆمم پرسی:
**«ئاخر من چ جۆرە مرۆڤێکم؟ باوکی خوالێخۆشبوویشم هەمووده‌م دەیگوت ئاخیر و عاقیبەتی من لەمە باشتر نابێت! بەدڵنیاییەوە دەبوو هیمەتێك بدەمە بەر خۆم و بچمە دەرەوە و کارێك بکەم. دەبوو بچمە دەرەوە و گوویەك بخۆم.. چوون و گەڕانەوە نییە! بەڵام سەرەتا واباشترە شەرابێکی ئامادە بفەرمووم!»**

پەرداخێکی ئاوخواردنەوەم پڕ کرد لە شەرابی پۆرت. تامێکی توندی هەبوو، بەڵام پیاو نەدەبوو لە کاتی خواردنەوەیدا بیری لێ بکاتەوە، دەنا هەمووی دەهێنایەوە.
ئەوە بوو هەرکاتێك پەرداخەکەم دەخواردەوە، لە نێو سینەمای هزرمدا فیلمێکی جوان و باشم نیشانی خۆم دەدا.
بۆ نموونە بیرم لە کۆشکێکی کۆن لە سکۆتلەندا دەکردەوە کە هەمووی قەوزەی بە دیوارەکانیەوە هەڵزنا بوو، بە پردی جووڵاو و خەندەقی پڕ لە ئاو و داری زۆر و ئاسمانی شین و هەوری چڕوپڕ دەورە دراوە.
یا جاری وەها ژنێکی پیاوکوژم دەهێنایە نێو خەیاڵمەوە کە بە نازەوە خەریکی داکێشانی گۆرەوییە ئاوریشمییەکانیەتی. ئەو

جارەیش، هەر ئەم فیلمی گۆرەوییە ئاوریشمیانەم نیشانی خۆم دایەوە.

شەرابەکەم هەڵدایە خوارەوە و گوتم:
**«من وا دەڕۆم. خواحافیز جەین.»**
**«خوات لەگەڵ، هێنری.»**

لە دالانەکەوە تێپەڕیم و لە پلیکانەکانەوە چوومە خوارێ. بە سەری پەنجەکانم و بە بێدەنگی بە بەر دەرگای شووقەی فەڕاشەکەمانەوە تێپەڕیم (چونکە کرێی مانگانەمان دواکەوتبوو) و وێڵی شەقام بووم.
کە سەرەولێژی تەپۆڵکەکەم بڕی، گەیشتمە حاشت شەقامەکانی شەشەم و یۆنیۆن. ڕێی شەقامی شەشەمم گرتەبەر و ڕووەو ڕۆژهەلات ڕێگەی خۆم درێژ کردەوە. سەوزیفرۆشێکی چکۆڵە لەوێ بوو کە بە پێشیدا تێپەڕیم، بەڵام دواتر گەڕامە دواوە و لێی نێزیک بوومەوە. سەوزە و میوەکانی بە پێشەوە هەڵچنیبوون. تەماتە هەبوو،و خەیار و پرتەقاڵ و ئەناناس و سندیش.
هەر لەوێ وەستام و چاوم دە میوەکان بڕی. چاوێکم بە نێو دووکانەکەدا گێڕا. پیرەپیاوێك کە بەرکۆشێکی بەستبوو، خەریکی قسەکردن بوو لەگەڵ ژنێکدا.
خەیارێکم لە نێو خەیارەکان هەڵگرت و خستمە گیرفانمەوە و بەڕێ کەوتم. هێشتا دە هەنگاو دوورتر نەکەوتبوومەوە کە دەنگی بەر گوێم کەوت:
**«هۆی، کابرا! لەگەڵ تۆمە، بوەستە، خەیارەکە لە شوێنی خۆی دانێوە تا پۆلیسم بۆت بانگ نەکردووە!**
**ئەگەر حەزت لێیە نەکەویتە نێو کونە ڕەشەوە، هەر ئێستا ئەو**

خەیارە بخەرەوە سەر جێیەکەی خۆی!»

گەڕامە دواوە و ئەو هەموو ڕێگەیەم بۆ دواوە بڕی تا خەیارەکە بخەمەوە سەر جێی خۆی. سێ چوار کەس ڕۆیشتنەکەیان شل کردبووەوە تا سەیر بکەن. خەیارەکەم لە گیرفانم دەرهێنا، خستمەوە سەر خەیارەکانی دیکە.
دواتر بەرەو ڕۆژئاوا کەوتمە ڕێ.
گەیشتمە شەقامی یۆنیۆن و سەرەوژووری تەپۆڵکەکەم گرتەبەر و وەسەر کەوتم، دواتر گەیشتمەوە بەر دەرگایماڵەوە.
لە پلیکانەی چوار قات سەرکەوتم، دەرگام کردەوە. جەین کە پەرداخە شەرابێکی بە دەستەوە بوو، سەیری کردم.

گوتم:
**«من بە کەڵکی زبڵدانیش نایێم. تەنانەت نەمتوانی خەیارێکیش بدزم.»**

جەین گوتی:
**«هەر بیری لێ مەکەوە.»**

گوتم:
**«بێنە بەساتی (پان کێك) پان کەوە!»**
..و چووم بەرەو لای گاڵۆنی شەرابەکە و پەرداخێکم بۆ خۆم تێ کرد.

.. بە حووشترێکەوە لە سەحرا دەڕۆیشتم. لووتێکم هەبوو زل زل، هەروەك دەنووکی باز، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا سەر و وەزعم

عەیبی نەبوو، سیپاڵێکی سپی خەت خەتم لەبەر بوو. پیاوێکی زۆر ئازا بووم.
چەند کەسێکم کوشتبوون. شمشێرێکی هیلالی گەورەم بە کەمەرەوە بوو.
بەرەو لای خێمەکەم دەڕۆیشتم کە کچێکی چواردە ساڵەی زۆر عاقڵ کە پەردەی کچێنی هێشتا نەدڕابوو، مشتاق و خوازیاری دیدارم بوو و لەسەر فەرشێکی دەستچن درێژ ببوو...

شەرابەکە چووە خوارەوە. تامە تاڵەکەی هەموو قەدوگیپاڵی بە مووچڕک خستم. بۆنی سووتانی ئاردی تێکەڵکراو بە ئاو، لووتی ئاخنیبووم.
پەرداخێکی دیکەم بۆ جەین و یەکێکی دیکەیشم بۆ خۆم تێ کرد.
هەر لە یەکێك لەم شەوە جەهەنەمییەی ئێمەدا بوو کە شەڕی جیهانی دووەم تەواو بوو. ئەگەر بمەوێت ڕاستییەکەی بێژم، لە ڕوانگەی منەوە شەڕ حەقیقەتێکی ناڕوون و لێڵە و بەس، و ئێستا تەواو بووە.
لە ئەنجامدا، دۆزینەوەی کار کە هەتا ئەوکاتی عەزابێکی گەورە و زانراو بوو، لە پێشان خراپتر بوو.
هەموو ڕۆژێك بەیانیان لەخەو هەڵدەستام، دەچوومە هەموو مەکتەبەکانی کاردیتنەوە وەك (مەکتەبی کاردیتنەوەی کێڵگەی کشتووکاڵی). سەعات (٤:٣٠)ی بەیانی بە خوومارى شەوی ڕابردووەوە لە خەو هەڵدەستام و نەگەیشتوو بە نیوەڕۆ دەگەڕامەوە.
کارم هەر ئەمە بوو کە بەردەوام لەم مەکتەبەوە بۆ مەکتەبێکی دیکە بچم.

جار جاره كارێكی كاتیم دەدۆزییەوە كە بریتی بوو لە خاڵیكردنی بارێكی پیكەبێك، و ئەویش لەسەر خێری مەكتەبێكی كاردیتنەوەی تایبەتی كە یەك لەسەر سێی مووچەكەی منی لاتوپاتی وەك دەستهەقی دۆزینەوەی كار لێ دەستاندم. لە ئەنجامدا، داهاتمان تا دەهات كەمتر دەبووەوە. وای لێهات كە كرێی شووقەكەشمان لە كاتی خۆیدا پێ نەدەدرا.

بەڵام هەروا گاڵۆنە شەرابمان ڕیز دەكرد، دڵداریمان دەكرد، شەڕ و دەمەقاڵێمان دەكرد، و چاوەڕێ دەماینەوە.

ئەگەر پارەیەكیشمان هەبایە، بە پێ دەچووینە بازاڕی گەورەی ناوەندی تا بتوانین گۆشت و گێزەر و پەتاتە و پیواز و كەرەوز بە هەرزان بكڕین. هەموومان هەڵدەڕشتنە نێو مەنجەڵێكەوە و دادەنیشتن سەری قسانمان دەكردەوە.

بۆن و بەرامی كوڵانی پیواز و سەوزە و گۆشتی نێو مەنجەڵەكە، هەوای ژوورەكەی دەئاخنی و ئێمەیش گوێمان لە دەنگی قوڵپەقوڵپەكەی دەگرت و دڵمان بەوە خۆش دەكرد كە بە زوویی دەست دەكەینە خواردنی.

جگەرەمان دەپێچایەوە و دەچووینە نێو جێگاوە. دواتر كە هەڵدەستاینەوە، دەستمان دەكردە گۆرانیگوتن. جارجارە فەڕاشەكە دەهاتە سەرەوە و دەیگوت بێدەنگ بین و ئەوەندە دەنگە دەنگ مەكەن و بەبیری دەخستینەوە كە كرێی ئەو مانگەمان هێشتا نەداوە.

كرێنشینەكان زۆر گلەییان لە دەنگ و شەڕوشۆڕەكانمان نەبوو، بەڵكو سكاڵایان لە گۆرانیگوتنەكانمان هەبوو، بەتایبەتی ئەو بەستانەیش كە دەمانچڕین، زۆر لەسەر دڵیان دەنیشت. وەك بەستەكانی:

من كە گیرفانم لە بێ پارەییان ڕزیبوو..

پیرۆزی خوا بەسەر ئەمەریکا..
پاشەکشێی پۆناپارت..
کاتێک باران دەبارێت، دڵم توند دەبێت..
گورگی گەورەی پیس، ترسی ناوێ..
من فریشتەی هاوسەرگیریم..
دڵم خوازیاری کچێکە هەروەك ئەو کچەی کە شووی بە باوکم کرد..
ئەگەر دەمزانی بۆ میوانداری دێیتەماڵم..
کەیکێکم دروست دەکرد..
. و لەم جۆرە گۆرانیانە.

***

## (An evil town - شاری خراپ)

ڤرانـك لـه پليكانه‌كانـه‌وه هاتـه خـواره‌وه. حـه‌زی لـه ئاسانسـه‌ر نه‌بـوو. حـه‌زی لـه زۆر شـت نه‌بـوو. لـه ئاسانسـه‌ر كه‌مـتر ڕقـی لـه پليـكان ده‌بـووه‌وه. خزمه‌تگوزاره‌كـه‌ی هۆتێله‌كـه بانگـی كـرد:

**+ «كاك ئيڤۆنـس! تكايه ده‌كرێـت بێيته ئێره؟»**

ده‌موچـاوی خزمه‌تگوزاره‌كـه وه‌كـو شـۆربای گه‌نمه‌شـانی بـوو. ڤرانـك هه‌مـوو هێـزی دايـه خـۆی تـا كۆنترۆڵـی خـۆی بـكات و لێـی نـه‌دات. كاربه‌ده‌سـته‌كه سـه‌يرێكی هـۆڵ و پێشـوازی هۆتێله‌كـه‌ی كـرد، دواتـر سـه‌ری لـێ نێزيـك كـرده‌وه.

**+ «كاك ئيڤۆنـس، ئێمـه چاودێريمان ده‌كردی.»**

خزمه‌تگوزاره‌كـه دووبـاره سـه‌يرێكی هۆڵـی پێشـوازييه‌كه‌ی كـرده‌وه. بينـی كه‌سـيان لێـوه نێزيـك نييـه، دووبـاره سـه‌ری هێنايـه پێشـه‌وه.

**+ «كاك ئيڤۆنـس، ئێمـه چاودێـری تۆمـان ده‌كـرد كـه بينيـمان عه‌قڵتان**

لەدەست داوە.»

خزمەتگوزارەکە گەڕایە دواوە و قیت سەیری فڕانکی کرد.
فڕانك گوتی:
**- «حەزم لێیە بچم سەیری فیلم بکەم. لە نێو شار فیلمێکی باش پێ دەزانی؟»**
**+ «با بگەڕێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان کاك ئیڤۆنس.»**
**- «زۆر باشە، من عەقڵم لە دەست داوە، چیتر؟»**
**+ «دەمانەوێت یارمەتیت بدەین کاك ئیڤۆنس. وابزانم پارچەیەکی عەقڵتمان دۆزیوەتەوە. دەتەوێت وەریگریتەوە؟»**
**- «زۆر باشە، کەوایە ئەو پارچەیەم بدەرەوە.»**

خزمەتگوزارەکە دەستی بردە ژێر مێزەکەوە و بەستراوێکی بچووکی بە زێڕوەرەق پێچراو دەرهێنا.
**+ «فەرموون کاك ئیڤۆنس.»**
**- «سوپاس.»**

فڕانك خستیە گیرفانیەوە و چووە دەرەوە. شەوێکی سەردی پاییزی بوو و ئەو بە شەقامدا ڕێی دەبڕی. نێزیکەو ڕۆژئاوابوون، لەسەر یەکەمین کۆڵان وەستا و چووە نێو کۆڵانەکەوە. دەستی خستە گیرفانیەوە و بەستە بچووکەکەی دەرهێنا. زێڕوەرەقەکەی لێ کردەوە. لە پەنیر دەچوو. بۆنی پەنیری دەدا. پارچەیەکی بچووکی لێ خوارد. تامی پەنیری دەدا. هەمووی خوارد، دووبارە لە کۆڵانەکە هاتە دەرەوەو کەوتە پیاسەکردن بە نێو شەقامەکەدا.
بەرەو لای یەکەمین سینەما چوو کە بینی. بلیتی کڕی و چووە

نێو تاریکاییەوە. لە پشتەوە دانیشت. زۆری لێ نەبوون. هەموو سالۆنەکە بۆنی میزی دەدا. ژنەکانی سەر پەردەی سینەماکە جلی سالانی (١٩٢٠)یان لەبەر دەکرد و پیاوەکانیشان قژەکانیان پارافینلێدراوانە شەق و ڕەق بەرەو دواوە شانە کردبوو. لووتیان زۆر درێژ بوو و وەك بڵەی کل بە ژێر چاوانیانەوە بێت. فیلمەکان هێشتا ئاخێوەرانە و دەنگدار نەبوون.

وشەکان لە بن فیلمەکەوە دەنووسران:

(بلانچ) تازە هاتبووە شارەوە.

پیاوێك بە قژی چەوری سافکراوە و بە بتڵێك جینەوە خەریك بوو بلانچی مەست دەکرد. واپێدەچوو خەریکی مەستکردنی بلانچ بێت.

بلانچ گێژ بوو. لە ناکاو پیاوەکە ماچی کرد.

فرانك سەیری دەوروپشتی خۆی کرد. هەموو سەلکەکان دەجووڵانەوە. ژنێك لە نێو سالۆنەکەدا نەبوو. وەك بڵەی کوڕەکان خەریکی مژینی یەکتری بوون و بەردەوام دەیانمژی. ماندوویيان نەدەناسی. ئەو پیاوانەی کە بە تەنیا دانیشتبوون، واپێدەچوو خەریکی دەستپەڕ لێدان بن.

پەنیرەکە بەتام بوو. حەزی لێبوو پەنیری زۆرتری پێ درابایە.

پیاوەکە بلانچی ڕووت کردەوە.

و هەر جارەی کە سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد، دەیبینی کوڕێك لێی نێزیکتر دەبێتەوە. دواتر تا سەیری پەردەکەی دەکردەوە، کوڕەکە دوو سێ کورسی دیکە لێی نێزیکتر دەبووەوە.

کە بلانچ مەست و گێژو و وڕ ببوو، پیاوەکە لەگەڵی دەستی کردە دەستبازی.

دووبـاره سـەیری کـوڕەی کـردەوە کـە سـێ کورسـی لێـوە دوور بـوو. بـە قورسـی هەناسـەی دەکێشـا. دواتـر کوڕەکـە گەیشـتە کورسـییەکەی تەنیشـتی.
کوڕەکە گوتی:
**«ئـۆی خوایا.. ئـۆهـ.. ئۆهـ. ئاه. ئاه! ئۆف! ئاه!»**

بەیانـی ڕۆژی دواتـر کـە بلانـچ لـە خـەو هەسـتا، تێگەیشـت دەسـتدرێژی کراوەتـە سـەر.
کوڕەکـە بۆنێکـی پیسـی لێـوە دەهـات، وەك بڵـەی قـەت قوونـی نەشووشـتبێت. کوڕەکـە لـە پێشـی چەمابـووەوە، هەڵدەلووشـییەوە.
فرانك زامنی چەقۆکەی کردەوە:
بە کوڕەکەی گوت:
**«ئـاگات لـە خـۆت بێـت! یـەك هەنـگاو بنێـە پێشـەوە، هەرچیت بەسـەر بێـت کێشـەی خۆتـە!»**

کوڕەکە گوتی:
**«خوای گەورە!»**

هەسـتا و خـۆی هەڵدایـە نێـو ڕێڕەوەکـەوە و دواتـر بـە پەلـە ڕۆیشـت بـەرەو پێشـەوە. دوو پیـاو لـەوێ دانیشـتبوون. کاتێـك کوڕەکـە گەیشـتە لایـان، یەکێکیـان خەریکـی دەسـتپەڕ بـوو بـۆ ئەویتریـان. ئـەو کـوڕەی کـە فرانکـی شـڵەژابوو، هەرلـەوێ دانیشت و کەوتـە سـەیرکردنی ئـەو دووانـە.

زۆر زوو بـەر لەوە بلانچ لـە قەحپەخانە بوو.
دواتـر فرانك کێری گرت. هەسـتا و بـەرەو لای تابلۆکە چوو:

بەڕێزان.. چووە ژوورەوە. ئەوێ بۆنێکی زۆری لێوە دەهات. لووتی گرت، دەرگای سەرئاوەکەی کردەوە و چووە ژوورەوە. کێری دەرهێنا و دەستی کردە میزکردن. دواتر گوێی لە دەنگێك بوو.
«وای خوایا، وای خوایا مارە، ماری کوبرا، باوکی پیرۆز، ئۆهههها!»

کونێك بە دیواری نێوان دوو ئاودەستەکەوە بوو. چاوی پیاوێکی تێدا بینی. ڕووی کێری کردە کونەکە و میزی بە چاوی پیاوەکەدا کرد.
پیاوەکە گوتی:
**«ئۆهههههه، ئۆهههههه پیس! ئۆهههههه حەیوانی گووی پیس!»**

گوێی لێبوو کە پیاوەکە کلێنسەکەی سەرئاوەکەی لێکردەوە و ڕووخساری وشك کردەوە و دواتر دەستی کردە هاوارکردن. فڕانك لە سەرئاوەکە هاتە دەرەوە، دەستەکانی شوشت. نەیدەویست درێژەی فیلمەکە ببینێت. دواتر خۆی لە نێو شەقامەکاندا بینییەوە، بەرەو لای هۆتێلەکەی چوو. پاشان چووە هۆڵی پێشوازی هۆتێلەکەوە. خزمەتگوزارەکەی هۆتێل بە سەر ئیشارەی بۆ کرد.
فڕانك پرسی:
**- «بەڵێ؟»**
**+ «بنۆڕە کاك ئیڤۆنس، داوای لێبوردن دەکەم. تەنیا گاڵتەم لەگەڵ کردن.»**
**- «باسی چی دەکەی؟»**
**+ «دەزانن.»**
**- «نا، نازانم.»**

**«کەمبوونەوەی عەقڵتان. ئەو کات مەست بووم. دەزانم کە**



عەقڵتان لە دەست نەداوە. تەنیا گاڵتەم کرد.»

فرانك گوتی:

«بەڵام عەقڵم کەم بووەتەوە و بۆ پەنیرەکەیش، زۆر سوپاس.»

دواتر هەڵگەڕایەوە و لە پلیکانەکانەوە سەرکەوت. کاتێک گەیشتە ژوورەکەی، لە پشت مێزی نووسینەکەیەوە دانیشت. چەقۆ زامندارەکەی دەرهێنا، زامنەکەی لێدا و سەیری تیغی چەقۆکەی کرد. لایەکیان تەواو تیژ بوو. دەیتوانی لاشەی یەکێکی پێ کون بکات یا هەڵدڕێت. دایدایەوە و خستییە گیرفانی دواوەی. دواتر قەڵەمەکەی هەڵگرت و دەستی کردە نووسین:

**دایکی خۆشەویستم**

ئێرە شارێکی پیسە. ئەهریمەن دەستی بەسەردا گرتووە. هەموو شوێنێك هەر سێکسی تێدایە، نەك وەك کردەیەکی جوان کە بە ویستی یەزدان بێت، بەڵکو وەك ئامرازێکی ئەهریمەنی. بەڵێ، بە دڵنیاییەوە ئێرە لە چنگ ئەهریمەندایە، لە چنگێکی پیس. کچە جەحێڵەکان ناچار بە خواردنەوەی جین دەکەین، دواتر پەردەی کچێنییان لە لایەن ئەم حەیوانانەوە کون دەکرێت و دەیاننێرن بۆ قەحپەخانە. ترسناکە، جێگەی باوەڕپێکردن نییە، دڵم پارچە پارچە بووە. دوێنێ بە کەنار دەریادا پیاسەم دەکرد، لە ڕاستیدا لە کەنار نا، لەسەر گاشەبەردەکانەوە

بووم، پاشان وەستام و هەر لەوێ دانیشتم و لە سرووشتی جواندا هەناسەم هەڵدەکێشا.
. دەریا، ئاسمان، خیزەڵان..
. لێوڕێژ بوو لە ژیانێکی بەختەوەرانە.
دواتر موعجیزەئاساترین ڕووداو کە دەشێت ڕووبدات، ڕوویدا. سێ سمۆرەی بچکۆلە لە خوارەوە سەیری منیان دەکرد و بە بەردەڵانەکەدا سەرکەوتن. دەموچاوە بچووکەکانیانم دەبینی لە کاتی سەرکەوتن و لە پشتی بەرد و قڵیشی گاشەبەردەکانەوە سەرەتاتکێیان دەکرد و سەیری منیان دەکرد، تا ئەوەی کە گەیشتنە بن قاچەکانم. چاوەکانیان دەمن بڕیبوو.
دایکە، هەرگیز چاوگەلی هێندە جوان و بێگوناهم نەبینیبوو. هەموو ئاسمان، هەموو دەریا و جاویدانەگی لە چاوانیاندا ڕەنگی دەدایەوە.

**دواجار ڕۆیشتم و ئەوان...**

کەسێك لە دەرگای دا.
فڕانك هەستا و دەرگاکەی کردەوە. خزمەتگوزاری هۆتێل بوو.
**- «بەڕێز ئیڤۆنس، من دەبێت قسەتان لەگەڵ بکەم، تکایە.»**
**+ «زۆر باشە، وەرە ژوورەوە.»**



خزمەتگوزاری هۆتێلەکە دەرگاکەی پێوەدا و روو لە رووی فرانك

ڕاوەستا. بۆنی شەرابی دەدا.

- «بەڕێز ئیڤۆنس، تکایە لای سەرۆکەکەم باسی ئەو هەڵە و لێکتێنەگەیشتنانەی کە دروست بوون، مەکە.»

+ «نازانم لەبارەی چییەوە قسە دەکەن.»

- «ئێوە پیاوێکی بێوێنەن کاک ئیڤۆنس، دەزانن، مەست بووم.»

+ «تۆ بەخشراوی، ئیتر بڕۆ.»

- « کاک ئیڤۆنس، شتێك هەیە کە دەبێت پێتانی بڵێم.»

+ «زۆر باشە، چییە؟»

- «من عاشقتان بوومە کاک ئیڤۆنس»

+ «ئۆو، مەبەستتان ئەوەیە کە عاشقی ڕۆحم بوون کوڕی باش؟»

- «نا، عاشقی لەشولارتان کاک ئیڤۆنس.»

+ «چی؟»

- «جەستەتان کاک ئیڤۆنس. ناڕەحەت مەن، بەڵام من دەمەوێتە دەستێکم بگیێن!»

+ «چی؟»

- «بمگیێن کاک ئیڤۆنس! نیوەی هێزی دەریایی ویلایەتە یەکگرتووەکان منیان گاوە! ئەوان دەزانن کە چ نیعمەتێکم کاک ئیڤۆنس. هیچ شتێك باشتر نییە لە کونێکی خڕ و خاوێن!»

+ «خێرا لێرە بڕۆ!»

خزمەتگوزاری هۆتێلەکە دەستەکانی بە دەوری فڕانکدا ئەڵقە کرد، دواتر لێوەکانی خستە سەر لێوەکانی فڕانك. دەمی زۆر تەڕ و فێنك بوو، بۆنێکی پیسی دەدا. فڕانك بۆ پشتەوەپاڵی پێوە نا.

«زۆڵی لادەر! ماچت کردم!»

**«من عاشـقتانم کاك ئیڤۆنس!»**

**«بەرازی پیس.»**

فڕانـك چەقۆکـەی دەرهێنـا، زامنەکـەی لێـدا، تیغـی چەقۆکـە دەرپەڕییـە دەرەوەو چەقۆکـەی دە ورگـی خزمەتگوزارەکـە ڕۆ کـرد. دواتـر کێشـایەوە دەرێ.

**« کاك ئیڤۆنـس.. خوای گەورە...»**

خزمەتگوزارەکـەی هۆتێلەکـە کەوتـە سـەر زەوی. هـەردوو دەسـتی لەسـەر برینەکـەی دانابـوو و هەوڵـی دەدا پێـش خوێنبەربوونەکـەی بگرێـت.

**«زۆڵ! ماچت کردم!»**

فڕانـك چەمایـەوە و زیپـی پانتۆڵـی خزمەتگوزارەکـەی کـردەوە. دواتـر کێـری گـرت، بـەرەو سـەرەوە ڕایکێشـا و سـێ لەسـەر چواری بـڕی. خزمەتگوزارەکـەی هۆتێلەکـە هـاواری کـرد:

**«ئاە خـوای گەورە، خوای من، خوای من..»**

فڕانـك چـووە نێـو حەمامـەوە، کیـرە بڕاوەکـەی خسـتە نێـو سـەرئاوەکەوە. سـیفۆنەکەی ڕاکێشـا. دواتـر دەسـتەکانی بـە جوانـی بـە ئـاو و سـابوون شووشـت و دووبـارە گەڕایـەوە ژوورەکـەی و لـە پشـت مێـزی نووسـینەکەی دانیشـتەوە. قەڵەمەکـەی دەسـتدایێ.

هەڵاتن و ڕۆیشـتن، بەڵام مـن نەمریم بینی.

دایکە..

دەبێت ئەم شارە بەجێ بهێڵم، ئەم هۆتێلە. ئەهریمەن هەمووانی بەغسیر کردووە. کە گەیشتمە شارێکی دیکە نامەت بۆ دەنووسم - ڕەنگە لە سانفرانسیسکۆ، پۆرتلەند یا سیاتیل. کەوتووەتە سەر دڵم کە بچم بەرەو باکوور. هەمووەم بیر لە تۆ دەکەمەوە و هیوای شادی و سەلامەتیت بۆ دەخوازم و هیوادارم یەزدانی مەزن هەمیشە پشت و پەنات بێت.

**بە عەشقێکی زۆرەوە...**

**کوڕت**
**فرانک**

ناوونیشانەکەی لەسەر زەرفی نامەکە نووسی. دەمی زەرفەکەی قەپات کرد و پوولی لێ دا و دواتر ڕۆیشت و نامەکەی خستە گیرفانەکەی تەنیشتی کۆتەکەیەوە کە بە کەنتۆرەکەوە هەڵواسرابوو. دواتر جانتایەکی لە خەزێنەکە دەرهێنا و لەسەر تەختەکەی دانا، دەرگاکەی کردەوە و دەستی کرد بە ڕیزکردنی شتەکانی.

***

# (ئەلـــــف)

زۆڵێك پارەكانـی هەڵگرتبوو..

هەمـوو بانگەشـەی ئەوەیـان دەكـرد كـە بەتاڵـن، وەرەقێنەكـە تـەواو بـوو، مـن لەگـەڵ هاوڕێكـەم ئەلـف دانیشـتبووم. (ئەلـف) هـەر لـە منداڵییـەوە لـە گا دەچـوو، تـەواو وێـران، سـاڵیانێك خـووی بـەوەوە گرتبـوو كـە لـە سـەر تەختەكـەی درێـژ بێـت و تۆپـە لاستیكییەكان لـە بـاوەش بگرێـت و ڕاهێنانـە شـێتانەییەكانی بـكات.

.. و ڕۆژێكیـان كاتێـك كـە لـە نێـو تەختەكـەی هاتـە دەرەوە، درێـژی و پانـی بـووە یـەك، و مـن لـە بـن گوێـی ئەلفـم دا و بتڵەكـە لەسـەر مێزەكـە كەوتـە سـەر زەوی (شـتێكی گوتبـوو كـە مـن لەگەڵـی هـاوڕا نەبـووم) و كاتێـك ئەلـف هەسـتایەوە بتڵەكـە لـە نێـو دەسـتمدا بـوو، ویسـكییەكی بـاش، وەهـا لـە چەنەگەیـم دا كـە وەبـن چەنەگـەی

و بەشێك لە گەردەنی گرتەوە و دووبارە کەوتەوە خوارەوە و من تەواو حاڵم باش بوو، خەریکی خوێندنەوەی (داستایۆفسکی) بووم و لە تاریکی گوێم لە (ماهلێر) دەگرت و دەرفەتی ئەوەم هەبوو تا قوومێك لە بتڵەکە بخۆمەوە.

بتڵەکەم لەسەر زەوییەکە دانا، بە مستەکۆڵەی ڕاست وەهام دەرخست کە دەیوەشێنم و بە چەپیش لە بن کەمەری بدەم. ئەو شل و وڵ بە کەوەنتەرەکە کەوت، ئاوێنەکە شکا، هەروەك نێو فیلمەکان دەنگی لێوە بەرز بووەوە، درەوشایەوە و پارچە پارچە بوو و لەو دەمەدا ئەلف مستەکۆڵەیەکەی لە نێوچاوانم سرەواند و پاشەو پاش کەوتمە سەر کورسییەك و کورسییەکە وەك پووش و پەڵاشێك پان بووەوە، قەنەفە هەرزانەکەیش و دواتر بارودۆخم خراپ بوو - دەستەکانم بچووك بوون و هێندەیش حەزم لە هەڵپڕژان نەبوو و چاوقایمیشم کەم نەکردبووەوە - و ئەو وەك لێبۆکێکی دوو پوولی، تۆڵەسێنەرانە بەرەو ڕووم پرتاوی دا و منیش هەر سێ گورزی ئەوم بە گورزێك وەڵام دەدایەوە، هەرچەندە ئەو گورزانەیش بڕسبڕ نەبوون.

بەڵام ئەو هێور نەدەبووەوەو.. بە هەموو شوێنێکدا کەلوپەلی شکاو بڵاو ببووەوە و دەنگە دەنگ بەرز بوو و هیوادار بووم کەسێك، خاوەن ماڵەکە، پۆلیس، خوا یا هەر کەسێکی دیکە بەری ئەو شەڕە بگرێت، بەڵام لێدان و کوتان هەروا بەردەوام بوو و پاشی ئەوەیش هیچم بیر نییە.

کاتێك بە هۆش خۆم هاتمەوە، خۆر هەڵاتبوو و من لە بن تەختەکە بووم. لە بنی هاتمە دەرەوە و هەستم کرد دەتونم لەسەر پێیەکانی خۆم بوەستم. بە بنی چەنەگەمەوە برینێکی گەورە دەبینرا. پانیەی پێیەکانیشم ڕووشابوون.

من خوماریی لەوە خراپتریشم بینیبوو و لە شوێنی خراپتر لە

خەو ڕاپەڕیبووم. وەك بەندیخانە؟ سەیری دەوروبەری خۆمم کرد. شەڕێکی ڕاستەقینە کرابوو. هەموو شتێك شکابوو، پیس، وێران و پەرش و بڵاو ببوو ـ گڵۆپ، کورسی، کەوەنتەر، تەخت، تەپلەکی جگەرە ـ خوێن بە هەموو لایەکدا ڕژابوو، هیچ شتێك لە شوێنی خۆی نەبوو، هەموو شتێك خراپ و پیس ببوو.

کەمێك ئاوم خواردەوە و دواتر بەرەو لای کەوەنتەرەکە چووم. هێشتا لەسەر شوێنی خۆیان بوون، دەییەکان، بیستییەکان، پەنجاییەکان، ئەو پارانەی کە لە کاتی وەرەقێنەکەدا و لە کاتی میزکردن دەمخستنە نێو گەنجینەکەوە و بیرم کەوتەوە کە شەڕەکە لەسەر پارەکە هەڵایسابوو.

پارە سەوزەکانم گلێر کردنەوە و خستمنە نێو جانتاکەمەوە. جانتا مەقەبابییەکەم خستە سەر تەختە خوار و خێچەکەمەوە و ئەو چەند جلکە کۆنەیەی کە هەمبوون، وەك کراسەکانی کرێکاری، پێڵاوە پانییەدارەکان کە ڕق و وشك ببوونەوە، گۆرەوییە پیسەکان کە وەك مەقەبایان لێ هاتبوو، ئەو پانتۆڵە چرچ و لۆچاوییانەی کە سەرە ئەژنۆکانی بە پیاو پێدەکەنین، کورتە چیرۆکێك لەبارەی ڕاوی قرژاڵەوە لە ماڵی ئۆپێراسی سانفرانسیسکۆ و ڕێنوێنگەیەکی دڕاوی دەرزیلێدانی دەرمانگە ـ «گۆڕانی فۆڕم ـ ئاراستەی کامڵبوونی قۆناغی گەشە لە مێژووی ژینگە»م خستنە نێویەوە.

کاتژمێرەکە کاری دەکرد، کاتژمێرە دەنگدارە کۆنەکە خوا بیپارێزێت، خوا دەزانێت چەند جار خوماراویانە سەعات(٧:٣٠) خوولەکی بەیانی سەیریم کردووە و گوتوومە لە قەبری بابی کار بم!

لە قەبری باوکی کار؟ نەو سەعات چواری دوانیوەڕۆ بوو.

هەریك بووم كاتژمێرەكەم دەخستە سەر جلەكانی نێو جانتاكەم ـ هەڵبەت بۆ نا؟ ـ كە كەسێك لە دەرگای دا ـ.

ـ بەڵێ؟
+ بەڕێز بۆكۆفسكی؟
ـ بەڵێ؟ بەڵێ؟
+ دەمەوێت بێمە ژوورەوە و مەلافە و پەردەكان بگۆڕم.
ـ نا، ئەوڕۆ نا. ئەوڕۆ نەخۆشم.
+ ئۆی، حەیف، بەڵام تەنیا ڕێگەم بدەن بێمە ژوورەوە و مەلافە و چەرچەفەكان بگۆڕم. زوو دەڕۆم.
ـ نا، نا، زۆر نەخۆشم. زۆر زۆر نەخۆشم. نامەوێت بەو بارودۆخەی كە هەمە جێگەكەم ببینی.

و هەر بەم شێوەیە.. ئەو دەیهەویست مەلافەكان بگۆڕێت. من دەمگوت، نا. چ لەش و لارێكی هەبوو. هەمووی لەش و لار بوو. هەموو لەشی هاواری دەكرد: لەشولارم، لەشولارم، لەشولاری من.

تەنیا دوو حەوتوو بوو لەوێ بووم.
جارێكیان لە قاتی خوارەوە بووم. خەڵكی دەهاتن بۆ بینینم و من لە ماڵەوە نەبوو، ئەو تەنیا دەیگوت:
**«ئەو لە بارەكەی خوارەوەیە، ئەو هەمووەدەم لە بارەكەی خوارەوەیە.»**
و خەڵكی دەیانگوت:
**«خوای گەورە، ئەوە چ خاوەن ماڵێكە كە تۆ هەتە، بەشەرە یا فریشتەیە؟»**

بەڵام ئەو ژنێکی سپیکارە و قەد و باڵا بەرز بوو و لەگەڵ فیلیپینییەکان ڕایدەبوارد و کوڕی ئەم فیلیپینیانە بۆ خۆیان فرت و فێڵگەلێکیان هەبوو، شتگەلێك کە هیچ کات پیاوێکی سپی پێست، تەنانەت منیش، لە خەوماندا نەماندەبینی و ئەم فیلیپینیانە بە کڵاوە لێوادارە پانەکانی جۆرج ڕافت و شانەگەلی تێپلداریانەوە، پێشڕەوانی مۆدە بوون. کوڕەیلی ئیستیلتۆ، بە ڕووخسار و زمانلووسی شەیتانانەوە ـ ئێوە لە کوێن؟
هەر چۆنێك بێت، من چەندین سەعات لەوێ دانیشتبووم و خەریك بوو شێت دەبووم. بێ ئۆقرە، بۆڵەبۆڵکەر و مات، لەوێ بە (٤٥٠) دۆلاری پارەی دەستکەوتوو دانیشتبووم و نەمدەتوانی بیرەیەکی بەرمیلی بکڕم. چاوەڕوانی تاریکی بووم.
مەرگ نا، تاریکی.
دەمویست بچمە دەرەوە. هەوڵێکی دیکە.. دواجار بوێری ئەوەم پەیدا کرد.
دەرگاکە کە جووت زەنجیر و قفڵڕێزێکی هەبوو. کەمێکم کردەوە، چەکوشەکەم بەرز کردەوە و یەکێك لەوان لەوێ بوو، مەیموونێکی بچکۆلەی فیلیپینی بە چەکوشێکەوە. کاتێك کە دەرگاکەم کردەوە، چەکوشەکەم بەرز کردەوە و بزەیەکی تاڵی کرد.
کاتێك کە دەرگاکەم پێوەدایەوە، چەند بزمارێکی لە لادەمییەوە دەرهێنا و وەهای نیشان دا کە بە فەرشی پلیکانەکانیانەوە دادەکوتێت کە بەرەو قاتی خوارەوە و بۆ دەرگای دەرەوە درێژ دەبووەوە.
نەمزانی چیرۆکەکە درێژەی هەیە. هەموو کاتەکان خەریکی کار بوو. هەر جارەی کە دەرگاکەم دەکردەوە، ئەو چەکوشەکەی

بەرز دەکردەوە و بزەیەکی تاڵی دەکرد.
مەیموونی گوو!
هەروا لەسەر پلیکانی یەکەمەوە وەستابوو. خەریک بوو شێت دەبووم.
ئارەقەکەم هەڵدەڕشت، بۆنی پیسم لێوەدەهات، بازنە بچکۆڵەکان دەسووڕانەوە و دەسووڕانەوە و دەسووڕانەوە، ڕووناکی لە هەموو لایەکەوە دەوری دەدام و درەوشانەوەی لە سەرمدا ڕەنگی دەدایەوە. هەستم دەکرد خەریکە بەڕاستی شێت دەبم.
چووم و جانتاکەم هەڵگرت. هەڵگرتن و گواستنەوەی پەڵاسە کۆنەکان ئاسان بوو. دواتر دەزگای تایپەکەم هەڵگرت.
دەزگایەکی تایپکردنی ئاسنین کە لە ژنی یەکێک لە هاوڕێکانم بە قەرز وەرمگرتبوو و هیچ کات نەمدابووەوە.

هەستێکی باشی هەبوو:
خۆڵەمێشی، پان، قورس، ئازاردەرانە و سووك و چرووکانە.
چاوەکانم لە نێو بنی سەلکمدا هەڵدەسووڕاند و زنجیرەکە لە قفڵەکە دەهاتە دەرەوە، لە کاتێکدا کە بە دەستێکمەوە جانتا و بە دەستەکەی دیکەمەوە دەزگای تایپە دزیارییەکەم پێ بوو، خۆم هەڵدایە نێو ئاگری لێکنەپچڕاوی ڕەشاشەکە، لە بن خۆرەتاوی سپێدەیی، بە نێو وردە گەنمە ژاکاوەکان، دواجار هەموو شتێك.
هۆی! بۆ کوێ دەڕۆی؟
مەیموونە بچکۆڵانەکە لەسەر ئەژنۆیەك هەستایە سەر پێ، چەکوشەکەی بەرز کردەوە، ئەمە ڕێك هەمان ئەو شتە بوو کە دەمەویست ـ بریسکانەوەی ڕووناکی لەسەر چەکوشەکەی - جانتاکە بە دەستی چەپمەوە بوو، دەزگای تایپە ئاسنینە دەستییەکە لە دەستی ڕاستم، ئەو لە شوێنێکی لەبار بوو، لە

سەر ئەژنۆکانم، بە وردبینییەکی تەوا و هەندێکیش تووڕەییەوە هەڵسووڕامەوە، بە لاتەنیشتە سفت و سافی دەزگای تایپەکەم لێمدا و هاوڕا لەگەڵ ئەوەیشدا کەللە سەرێکم تێی سرەواندە پەرستگەی وجوودی.
شتێکی هاوشێوەی شۆکێکی کارەبایی بوو، وەك ئەوەی کە هەموو شتێك دەگریا، دواتر هێور بووەوە.
لە دەرەوە بووم، لە ناو پێڕەوەکە لە بنی پلیکانەکان، بێ ئەوەی ئاگام لێیان بێت.
لە بەختی من، تاکسییەك هات.

**تاکسی!**

سواری بووم. وێستگەی یۆنیۆن.
دەنگی هێواشی تەگەرەکانی تاکسییەکە لەو بەیانییەدا، زۆر دڵگیر بوو.
گوتم:
**- نا بوەستە. بڕۆ بۆ گەراجی پاس.**
**+ چیتە بابە؟**
**- هەر ئێستا باوکمت کوشت؟**
**+ باوکی خۆتت کوشت؟**
**- تا ئێستا گوێت لە ناوی مەسیحیی پیرۆز بووە؟**
**+ ئەی چۆن.**
**کەوایە، بڕۆ بۆ گەراجی پاسەکان.**

سەعاتێك لە گەراجی پاسەکان دانیشتبووم و چاوەڕوانی پاسی نیوئاورلان بووم. بە خۆمم گوت کوڕەم نەکوشتبێت؟!!

دواجار بە دەزگای تایپ و جانتاکەمەوە سووار بووم، دەزگای تایپەکەم خستە نێو ڕەفەکەی سەر سەرم، چونکە نەمدەویست بەسەر سەرم بکەوێت. ڕێگەیەکی درێژ بوو بە مەشرووبێکی زۆر و کەمێك ڕاڕایی و قژخەنەییەك بە سواری (فۆرت وۆرس).
لە فۆرت وۆرس دابەزیم، بەڵام ئەو لەگەڵ دایکیدا دەژیا و من ناچار بووم ژوورێك بە کرێ بگرم.
بە هەڵە لە قەحپەخانەیەك ژوورم بەکرێ گرت.
بە درێژایی شەو ژنەکان بە قیژەقیژەوە شتگەلێکیان دەگوت وەك:
**«هۆی! پارەی کەم بدەی، ناتوانی ئەو شتەت بخەیتە قوزمەوە!»**

بە درێژایی شەو دەنگی سیفۆنی سەرئاوەکە دەهات. دەنگی کرانەوە و پێوەدانی دەرگاکان. ژنە قژ خەنەییەکە، دلۆڤان و بێگوناە بوو یا ئەوەی کە بە دوای پیاوێکی باشترەوە بوو. هەر چۆنێك بێ بەر لەوەی دەستم بگاتە دەرپێیەکەی، شارەکەم جێ هێشت. دواجار گەیشتمە نیوئۆرلان، بەڵام ئەلف، خۆ لەبیرتانە وانییە؟ هەر ئەو کەسەی کە لە ژوورەکەمدا لەگەڵیدا بووە شەڕمان. لە ڕاستیدا ئەو لە شەڕی ڕەشاشدا کوژرابوو. بیستبووم کە بەر لە مردن بۆ ماوەیەکی درێژ، سێ یا چوار حەوتوو، لە نەخۆشخانە خەوێندرابوو و سەیرتریش لەوە، بە منی گوتبوو، نا لە منی پرسیبوو:
**«دەتوانی گریمانەی ئەوە بکەی کە زۆڵێکی گەمژە دەست بخاتە سەر پەلاپیتکەی ڕەشاشەکە و لە نیوقەددا بمکاتە نیوە؟**

**«بەدەر لەمە خەتای خۆتە.»**
**«دەی، من دەزانم کە تۆ هیچ کات بە ڕەشاشێکی قەحپە نامری.»**

«دەتوانـی بـە تـەواوی لـەوە دڵنیـا بیتـەوە خۆشەویسـتەکەم، مەگـەر ئـەوەی کـە ڕەشاشـی مامـە سـام بێـت.»
«هێنـدە قوزەقـوزێ مەکـە! دەزانـم کـە عاشـقی وڵاتەکەتـی. دەتوانـم ئەمـە لـە چاوەکانـت بخوێنمـەوە! عەشـق، عەشـقی ڕاسـتەقینە!»

و هـەر لـەو کاتەدا بوو کە لێم دا.
و ئیتر لە درێـژەی چیرۆکەکە تێ دەگەن.
کاتێـك گەیشـتمە نیـو ئـۆرلان، وریـا بـووم کـە لـە قەحپەخانەیـەك ژوور بەکـرێ نەگـرم، تەنانـەت ئەگـەر هەمـوو شـاریش لـە قەحپەخانەیـەك بچێـت.

***

# (یەك دۆلار و بیست سەنت)




کۆتاییەکانی هاوینم لە هەموو کاتێکی دیکە خۆشتر دەوێت. پاییز نا، ڕەنگە پاییزیش بوو، هەر چۆنێك بێت، کەنار ئاوەکە سارد ببوو و ئەو حەزی لێ بوو ڕێك ئەو کاتەی کە خۆر ئاوا دەبێت لە ڕۆخ ئاوەکە پیاسە بکات. کەس لەو دەوروبەرە نەبوو و ئاوەکە پیس دەهاتە پێش چاو، بە ئاوێکی کوژهر دەچوو و باڵندە دەریاییەکان گەرەکیان

نەبووْ بخەون، ڕەقیان لە خەوتن دەبووەوە.
مەلە دەریاییەکان چراویلکەیان لێ دەدا و بە چاو و ڕۆح و باڵەفڕکێ دەهاتنە خوارەوە.
ئەگەر شتێك لە ڕۆحت نەمابێتەوە و خۆت ئەمە بزانی، کەوایە هێشتا ڕۆحت ماوەتەوە.
پاشان زۆرجار دادەنیشت و سەیری ئاوەکەی دەکرد.
ئەو دەمانەی سەیری ئاوەکە دەکەی، باوەڕکردنی هەموو شتێك بۆت دژوار دەبێت. باوەڕکردنی شتگەلێکی وەك ئەوەی کە وڵاتێك بە ناوی چین هەیە یا ئەمەریکا یا شوێنێك بە ناوی ڤیتنام.
یا ئەوەی کە مرۆڤ سەردەمێك منداڵ بووە..
بەڵام نا، کاتێك کە بیری لێ دەکردەوە باوەڕپێهێنانی ئەوەی دواییان هێندەیش قورس نەبوو، منداڵی بۆی جەهەنەم بوو، نەیدەتوانی لەبیری بکات.
و گەورەساڵی:
هەموو ئەو کارانە و هەموو ئەو ژنانە و دواتر نەمانی تەنیا ژنێکیش و ئێستایش تەنانەت هیچ لە ئارادا نەبوو، هیچی بۆ نەمابووەوە، قەلەندەر و خوێرییەکی تەمەن شەست ساڵ.
تەواو..
هیچ..
هەموو ماڵی دنیای، (دۆلارێك و بیست سەنت) بوو.
کرێی یەك حەوتووی ژوورەکەی درابوو.
ئۆقیانووس..
دووبارە بیری لە ژنەکان دەکردەوە. هەندێك لە ژنەکان لەگەڵی باش بوون و ئەوانی دیکە سەڵیتە، زماندرێژ و مۆن

و کەمێک شێت و تۆقینەرێکی نەخوازراو. ژوور و تەخت و کریسمس و کار و گۆرانی و نەخۆشخانە و دڵتەنگی و شەوانی پڕ لە غەم و بێمانا، بێ هیچ چانسێک.

و ئێستا نرخی شەست ساڵ، یەک دۆلار و بیست سەنت بوو..
دواتر دەنگی پێکەنینیانی لە پشتە سەرەوە بیست. ئەوان بەتانییان هەبوو و قووتوو و شووشەی بیرە، قاوە و لەفە.. پێدەکەنین، پێدەکەنین..
دوو کوڕی جەحێڵ، دوو کچی جەحێڵ.
لاواز، بە لەشولارێکی ڕێک و بێ دڵەڕاوکێ.
دواتر یەکێک لەو دووانە چاویان پێی کەوت.
**«هۆی، ئەوە چییە لەوێ؟»**
**«یا مەسیح، نازانم!»**
**جووڵایەوە.**
**«دەکرێ مرۆڤ بێت؟»**
**«هەناسە دەکێشێ؟ دەگیێ؟»**
**«چی دەگیێت؟»**

هەموویان پێکەنین.
شووشە شەرابەکەی بەرز کردەوە. کەمێک لە بنی بتڵەکە مابووەوە. ئیتر ئێستا بە دڵەوە دەنووسێت و بەتامە.
**«ئەو خەریکە دەجووڵێت! سەیری بکەن، دەجووڵێت!»**

هەستا و خیزەکەی بە پانتۆڵەکەیەوە داوەشاند.
**«دەستی هەیە، پێ! ئەو دەموچاوی هەیە!»**
**«ڕووخسار؟»**

دووبـاره پێکەنینـەوە. ئـەو تێنـاگات. منداڵـەکان وەهـا نەبـوون.
منداڵـەکان شـەڕانی نەبـوون. ئەمانـە کێـن؟

بەرەو لایان چوو..
**- «پیری جێگەی شـەرمەزاری نییە.»**

یەکێـك لـە کـووڕە جەحێڵـەکان دواهەمیـن چـۆڕی بیرەکـەی
هەڵقوڕانـد. قوتووەکـەی فـڕێ دا.
**«ئـەوەی جێگـەی شـەرمەزارییە، ئـەو سـاڵانەیە کـە بـە فیـڕۆ
چـوون بابۆڵـە. بـە بـڕوای مـن تـۆ بـە خەسـار چـووی.»**
**- «مـن هێشـتا پیاوێکـی باشـم کوڕی باش.»**
**«وادابنـێ یەکێـك لـەم کچانـە بیهەوێـت بـە تۆزقاڵـە قوزێکـەوە
میوانداریـت بـکات بابۆڵـە، ئـەودەم چ دەکـەی؟»**
**«ئـەو قسـانە مەکە ڕۆد!»**

ئـەم قسـەیە کچێکـی جەحێـڵ کـردی کـە قژێکـی درێـژی
شـەرابی هەبـوو. دەسـتی دەهێنـا بـە قـژە ئاڵۆزەکەیـدا، وەك
ئـەوەی بـای بیلەرێنێتـەوە.
**«چ دەڵـەی باپیـرە؟ چ دەکـەی؟ هـا؟ ئەگـەر یەکێـك لـەم کچانـە
بێـت و لەسـەرت درێـژ بێـت، چ دەکـەی؟»**

بـەڕێ کـەوت و ڕۆیشـت، بـە دەوری بەتانییەکەیانـدا سـووڕایەوە
و بەسـەر خیزەکـەدا بـەرەو پەرسـتگە پەڕژیندارەکـە چـوو.
**«ڕۆد، بۆچـی لەگـەڵ ئـەو پیرەپیـاوە بەدبەختـە بـەو شـێوەیە
قسـە دەکـەی؟ هەندێـك جـار ڕەقـم لێـت دەبێتـەوە!»**

«وەرە ئێرە خۆشەویستەکەم!»

«نا!»

وەرسووڕایەوە، بینی ڕۆد بە دوای کچەکە کەوتووە و ئەویش دەقیژێنێ، دواتر پێکەنی.

پاشان ڕۆد گرتی و پێکەوە کەوتنە سەر خیزەکە و لنگاوقووچ بوونەوە و پێکەنین. دووانەکەی دیکەیشی بینی کە قیت وەستابوون و دەمیان نابووە دەمی یەکترییەوە.

بەسەر تەختەچنەکەی ڕۆخی ئاوەکەوە پیاسەی کرد. لەسەر کورسییەك دانیشت و خیزی پێیەکانی داتەکاند. دواتر پێڵاوەکانی لە پێ کرد. دە خوولەك دواتر گەڕایەوە ژوورەکەی. پێڵاوەکانی داکەند و لەسەر تەختەکەی درێژ بوو. گڵۆپەکەی پێ نەکرد.

یەکێك لە دەرگای دا..

+ «کاك ئێسنید؟»

- «بەڵێ؟»

دەرگاکە کرایەوە.

خاون ماڵەکە بوو. خاتوو کانێرز.

خاتوو کانێرز شەست و پێنج ساڵان بوو.

تاریك بوو، بۆیە دڵخۆش بوو کە ناتوانێت ڕووخساری ببینێت.

+ «کاك ئێسنید؟»

- «بەڵێ؟»

+ «کەمێك سووپم لێناوە. سووپێکی بەتامە. حەزت لێیە قاپێکتان بۆ بێنم؟»

- «نا، نامەوێت.»

**+ «ئۆی، باش بیر بکەنەوە کاك ئێسنید، سووپێکی بەتامە، زۆر بەتامە! با قاپێکتان بۆ بێنم!»**

**- «باشە، زۆر باشە.»**

هەستا و لەسەر کورسییەکە دانیشت و چاوەڕێ ما. خاتوو کانێرز دەرگاکەی بە کراوەیی هێشتبووەوە و ڕووناکی ڕێڕەوەکە دەهاتە ژوورەوە.

تیشکۆکەیەك لە پێ و ئەژنۆی دەدا. خاتوو کانێرز سووپەکەی لەوێ دانا.

قاپێك سووپ و کەوچکێك..

**+ «حەزتان لێیە کاك ئێسنید. سووپی من بەتامە.»**

گوتی:

**- «زۆر سوپاس.»**

دانیشت و سەیری سووپەکەی کرد. لە زەرداوی میز دەچوو. سووپی مریشك بوو، بێ گۆشت. دانیشت و کەوتە سەیرکردنی ئەو دڵۆپە چەوریانەی کە بە سەر سووپەکەوە قەتماغەیان بەستبوو. کەمێك ڕاما. دواتر کەوچکەکەی لە قاپەکە هێنایە دەرەوە و لەسەر مێزەکەی دانا.

پاشان بە سووپەکەوە بەرەو لای پەنجەرەکە چوو و تۆڕی پەنجەرەکەی کردەوە و بە هێواشی سووپەکەی ڕشتە دەرەوە. کەمێك هەڵم بەرز بووەوە و نەما. قاپەکەی لەسەر مێزەکە دانایەوە، دەرگاکەی پێوەدا و گەڕایەوە سەر تەختەکەی.

لە هەموو کاتێك تاریکتر بوو، ئەو حەزی لە تاریکی بوو، دەکرا لە تاریکی بگات.

بە وردی گوێی دایی و توانی دەنگی ئۆقیانووس ببیستێت..
کەمێك گوێی دایە دەنگی ئۆقیانووس..
و دواتر ئاهێکی هەڵکێشا..

**لە کۆمەڵەی:**

(چیرۆکەکانی شێتایەتییە باوەکان ـ Tales of ordinary madness)

# (خۆشەویستیتم پێ ببەخشە)

# BRING ME YOUR LOVE

چارلز بوکوفسکی

**CHARLES BUKOWSKI**



**ILLUSTRATIONS BY R. CRUMB**

(هێری) لە پلیکانەکانەوە چووە خوارەوەو گەیشتە حەسارەکە. زۆرێك لە نەخۆشەکان لە دەرەوە بوون. پێیان گوتبوو ژنەکەی (گلۆریا) لە نێو حەسارەکەیە.

بە تەنیا لە پشت مێزهێکەوە دانیشتووە. قەدبڕی لێدا و لێی نێزیک بووەوە.

بە دەوری مێزەکەدا خوولایەوە و ڕووبەڕووی دانیشت. گلۆریا ڕەپ و ڕەق دانیشتبوو، ڕەنگی پەڕیبوو. سەیری دەکرد، بەڵام ئەوی نەدەبینی.

دواتر ئەوی بینی.

پرسی:

**+ «تۆ بەڕێوەبەری؟»**

**- «بەڕێوەبەری چی؟»**

**+ «بەڕێوەبەری شیمانەکانی؟»**

**- «نا، من بەڕیوەبەری شیمانەکان نیم.»**

ڕەنگی پەڕیبوو، چاوەکانی کز و شینێکی کزۆڵە.

**- «حاڵت چۆنە گلۆریا؟»**

مێزە ئاسنەکە سپی و چەندین سەدە تەمەنی بوو. لە نێوەڕاستیدا گوڵدانێکی بچکۆلانە هەبوو بە چەند گوڵی پلاستیکییەوە کە قەدێکی شل و وڵیان هەبوو و لە ژاکان شۆڕ ببوونەوە.

**+ «تۆ قەحبەگێی، قەحپەکان دەگێێ.»**

**- «وانییە گلۆریا.»**

**+ «دەشتمژن؟ کێرت دەمژن؟»**

**- «دەمویست دایکیشت لەگەڵ خۆمدا بهێنم گلۆریا، بەڵام پەسیوی گرتبوو و نەخۆش کەوتبوو.»**

+ «هەمـوودەم شـتێك ئـەو كوندەپەپـووە پیـرە نەخـۆش دەخـات. تـۆ بەڕێوەبـەری؟»

نەخۆشـەكانی دیكـە لـە پشـت مێزەكانـەوە دانیشـتبوون یـا لـە تەنیشـت دارەكانـەوە وەسـتابوون یـا لـە نێـو فریزەكـەدا پـان ببوونـەوە. بـێ جووڵـە و بێدەنـگ.

**- «گلۆریا ئێرە خواردنی چۆنە؟ لێرە هاوڕێت هەیە؟»**

**+ «تۆقێنـەر. نا. قەحپەگێ!»**

**- «هیچـت بـۆ خواردن پێویسـت نییە؟ بۆ خـواردن چیت بۆ بێنم؟»**

گلۆریـا وەڵامـی نەدایـەوە. دواتـر دەسـتی ڕاسـتی بـەرز كـردەوە. سـەیری دەسـتی كـرد و گرمۆڵـەی كـرد و پاشـان زۆر تونـد كێشـای بـە لووتـی خۆیـدا.



هێری هات و هەردوو دەستی گرت..
- «تکایە گلۆریا.»

گلۆریا دایە پرمەی گریان..
+ «بۆچی چوکلێتم بۆ ناهێنی؟»
- «ئەی پێت نەگوتبووم ڕەقت لە چوکلێت دەبێتەوە.»

وەکو جۆگەلە فرمێسکی دادەباراند..
+ «من ڕەقم لە چوکلێت نابێتەوە. من عاشقی چوکلێتم.»
- «مەگری گلۆریا. تکایە. هەر شتێك بوێ بۆتی دەهێنم.. من هەر لەم نێزیکیانە ژوورێکم لە مۆتێل بەکرێ گرتووە، تەنیا بۆ ئەوەی لێتەوە نێزیك بم.»

چاوە بێهێزەکانی گلۆریا کرانەوە..
+«مۆتێل؟ لەگەڵ قەحپەیەکی پیرەقرچۆڵ. پێکەوە لە ژێر بنمیچی ئاوێنەیی، سەیری فیلمە سێکسییەکان دەکەن.»

هێری ماستاوچییانە گوتی:
- «دەمەوێت یەك دوو ڕۆژێك لە نێزیکتەوە بم گلۆریا. هەر شتێکت بوێت بۆتی دەهێنم.»

چەند نەخۆشێك هەڵگەڕانەوە و سەیریان کردن.

- «گلۆریا دڵنیام کە هیچ کەس بە قەدرا من ئاگای لە تۆ نییە.»
+ «دەتهەویست چوکلێتم بۆ بێنی، چوکلێتەکان دە قوونت هاوێ.»

هێری لە جانتای پارەکەی کارتێکی دەرهێنا، کارتی مۆتێل بوو.
کارتەکەی دایە گلۆریا.
**- «تا لەبیرم نەچووە با ئەمەت بدەمێ. دەتوانی تەلەفۆن بکەی؟ ئەگەر شتێکت ویست تەنیا تەلەفۆنم بۆ بکە.»**

گلۆریا وەڵامی نەدایەوە. کارتەکەی گرت و بە شێوەی چوارگۆشەی بچکۆلانە تاتای کرد. دواتر داچەمایەوە و لنگە پێڵاوێکی دەرهێنا، کارتەکەی خستە نێو پێڵاوەکەیەوە و دووبارە لە پێی کردەوە.
هێری بینی کە دوکتۆر (جۆنسۆن) بەسەر فریزەکەوە نێزیک دەبێتەوە.
دوکتۆر جۆنسۆن بزەی بەسەر لێوەوە بوو و لە کاتی ڕێگاڕۆیشتن دەیگوت:
**«دەی، دەی، دەی..»**
گلۆریا بێ هەیەجان گوتی:
**+ «سڵاو دوکتۆر جۆنسۆن.»**

دوکتۆر پرسی:
**«دەتوانم دانیشم؟»**

گلۆریا گوتی:
**+ «هەڵبەت.»**

دوکتۆر پیاوێکی قورس بوو.
بۆنی پیس و چڵکی قەڵەوی و بەرپرسیاریەتی و دەسەڵاتی لێوە دەهات. برۆکانی شێوەیان ئەستوور و قورس بوون، خۆ لە ڕاستیشدا زل و ئەستوور بوون. حەزیان لێبوو شۆڕ ببنەوە بۆ نێو

دەمەخڕ و تەڕەکەی و تێیدا ون بن، بەڵام ژیان نەیدەهێشت.
دوکتۆر سەیری گلۆریا و هێری کرد و گوتی:
«دەی، دەی، دەی.. من زۆر ڕازیم لەو بەرەوپێشچوونانەی کە تا ئێستا کردوومانە...»
+ «بەڵێ دوکتۆر، هەر ئێستا خەریک بوو بە هێریم دەگوت کە هەست دەکەم بەهێز و توندوتۆڵ بوومە، چەندە ئەم ڕاوێژ و دانیشتنە بە کۆمەڵانە کاریگەرانەی لەو تووڕەبوونە بێهۆکارە، بێهیوایی بێئەنجام و دڵسۆزی وێرانکەر بە حاڵی خۆم، زۆر کەم بووەتەوە.»

گلۆریا بزەی بەسەر لێوەوە بوو و دەستەکانی خستبوونە سەر داوێنی کراسەکەی. دوکتۆر بزەیەکی بۆ هێری کرد. «گلۆریا بە شێوەیەکی بەرچاو باش بووە.»

هێری گوتی:
- «بەڵێ، ئاگات لێیە.»
«هێری، وابزانم تەنیا کەمێکی دیکە کات پێویستە تا گلۆریا دووبارە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە بۆ لات.»

گلۆریا گوتی:
+ «دوکتۆر، جگەرەیەکم دەدەیتێ؟»

دوکتۆر لە کاتێکدا کە پاکەتە جگەرەیەکی سەیر و سەمەرەی لە گیرفانەکەی دەکێشایە دەرەوە، گوتی:
«بۆچی نا، هەڵبەتە عەزیزەکەم.» و جگەرەیەکی لە پاکەتەکە دەرهێنا. گلۆریا وەریگرت و دوکتۆر فەندەکێکی زیوینی دەرهێنا،

پێی کرد. گلۆریا نەفەسێکی هەڵکێشا و دایەوە دەرەوە.

گوتی:

+ «دەستێکی جوانت هەن دوکتۆر جانسۆن.»

**«بۆچی، سوپاس عەزیزەکەم.»**

**«جۆرە دلۆڤانییەکت هەیە کە پیاو دڵنیا دەکاتەوە، جۆرە دلۆڤانییەکانی شیفابەخشانە...»**

دوکتۆر جانسۆن بە هێوری گوتی:

**«دەی لە ڕاستیدا ئێمە هەموو هەوڵی خۆمان بۆ نەخۆشەکانی ئەم شوێنە کۆنە دەدەین.. ئێستا ببوورن، من دەبێت لەگەڵ نەخۆشەکانی دیکەیش قسە بکەم.»**

لاشەی بە ئاسانی لەسەر کورسییەکە بەرز کردەوە، ڕێگای تا سەر مێزێکی دیکە کە لە پشتییەوە ژنێك دانیشتبوو و بۆ چاوپێکەوتنی پیاوێکی دیکە هاتبوو.

گلۆریا دە هێری ڕاما:

+ «زلەی قەحپە، خواردنی سستەرەکان دەخوات.»

- **«گلۆریا زۆرم حەز لێیە زایاترت لە لا بمێنمەوە، بەڵام ڕێگەیەکی زۆرم بە ئۆتۆمبێل بڕیوە تا هاتووم، دەبێت پشوو بدەم. وابزانم دوکتۆر ڕاست دەکات، زۆر باشتر بووی.»**

گلۆریا پێکەنی، بەڵام پێکەنینی شادی نەبوو، وەك بیرەوەرییەکی دوور پێکەنینێکی دەستکرد بوو.

+ **«من هیچ باشتر نەبوومە، لە ڕاستیدا کۆتاییمە.»**

- «وانییە گلۆریا...»
+ «مـن نەخۆشـم سـەلکە ماسـی! خـۆم لـە هـەر کەسـێکی دیکـە باشـتر لـە نەخۆشـی خـۆم تێدەگـەم.»
- «ئەم سـەلکە ماسـییە چ بوو کە گوتت؟»
+ «تا ئێسـتا کەس پێتی نەگوتووە کە سـەرت لە ماسـی دەچێت؟»
- «نا.»
+ «جارێکـی دیکـە کـە ڕیشـت دەتاشـی، ئـاگات لـە خـۆت بێـت پـەڕە سـییەکانت نەبڕیـت.»
- «من دەڕۆم.. بەڵام سبەی دووبارە دێمەوە لات.»
+ «جاری داهاتـوو بەڕێوەبەر بێنە.»
- «دڵنیـای کە هیچـت ناوێ بۆت بێنم؟»
+ «تـۆ وا دەگەڕێیتـەوە بـۆ مۆتێـل تـا قەحپەیـەك بگێێـی، ئیـتر چیـم بـۆ دێنـی.»
- «پێـت باشـە (نیۆیـۆرك) لەگـەڵ خـۆم بێنـم؟ خـۆ تـۆ گۆڤـارت خـۆش دەوێ...»
+ «(نیۆیـۆرك) دە قونـت ئاخنـە. سـەلکە ماسـی! پاشـی ویـش (تایـم) ی تێئاخنە.»

هێری ئەو دەستەی گلۆریا کە لە خۆی دابوو، دەگوشێت:
- «کەمێك بـە خـۆت ڕابگە. کەمێك هـەوڵ بدە. زوو چاك بیتەوە...».

گلۆریـا هیـچ نیشـانەیەکی لـە خـۆی نیشـان نـەدا لـەوەی کـە گوێـی لـە قسـەکانی ئـەو بووبێـت.
هێـری بـە هێواشـی، سـووڕایەوە و بـەرەو لای پلیکانـەکان بـەڕێ کـەوت. کـە لـە نیـوەی پلیکانـەکان چـووە سـەرەوە ئـاوڕی دایـەوە و بـە هێواشـی دەسـتی بـۆ گلۆریـا بـەرز کـردەوە.

ئەو بێ جووڵە دانیشتبوو.

***

نووقمی تاریکی ببوون، چاك دەچووە پێشەوە تا ئەوەی تەلەفۆنەکە زرینگایەوە. هێری درێژەی بە گانکردن دا، بەڵام تەلەفۆکەیش درێژەی بە زرینگانەوە دا. زۆر جارەسکەرانە بوو. کێری زوو خاو بووەوە.

گوتی:

- «گووهـ»

..و کێری تێدا هێنایە دەرەوە. گلۆپەکەی پێ کرد و تەلەفۆنەکەی هەڵگرت.

- «ئەلەو.»

گلۆریا بوو:

+ «خەریکی قەحپەگێی.»

- «بۆ گلۆریا دەهێڵن بەم درەنگوەختە تەلەفۆن بکەی؟ حەپی خەو، شتێکتان نادەنێ؟»

+ «بۆچی ئەوەندە درەنگ وەڵامی تەلەفۆنەکەت دایەوە؟»

- قەت یاریت نەکردووە؟ ئێستا ڕێك لە نێوەندی یارییەکی خۆشدا بووم. خۆت منت کێشایە نێو ئەم یارییە باشەوە.»

+ «مەرج دەبەستم وایە.. دوای ئەوەی کە تەلەفۆنەکەت دانایەوە دەڕۆی تا تەواوی بکەی.»

- «گلۆریا، ئەم شێتایەتی و بەدگوومانییە نەفرەتییە تۆی

کێشاوەتە نێو ئەم بارودۆخەی کە ئێستا تێی کەوتووی.»
+ «سەلکە ماسی، شێتیایەتی و بەدگومانی من هەردەم پێشەنگی حەقیقەت بووە...»
- «گوێ بگرە، هیچ حاڵت باش نییە. هەوڵ بدە بخەویت. سبەی دێم بۆ دیتنت.»
+ «زۆر باشە سەلکە ماسی. بڕۆ بە گانکردنەکەت ڕابگە!»

گلۆریا تەلەفۆنەکە دادەخاتەوە.

**

(نـان ـ Nan) بـە سەرکراسـێکەوە (ڕۆب)، لەسـەر لێـواری تەختەکـە دانیشـتبوو. پەیکـە ویسـکی و ئاوەکـەی لەسـەر مێزەکـەی بەردەمـی بـوو.

جگەرەیەکەی داگیرساند و پێی خستە سەر پێی.

پرسی:

**+ «ئـەرێ خاتوونـە چکۆڵەکەمان چۆن بوو؟»**

هێری مەشرووبێکی بۆ خۆی تێ کرد و لە تەنیشتی دانیشت.

**ـ «زۆر بەداخم نان.»**

**+ «داخـداری بۆچـی؟ بۆ ئەو، من یا کێ؟»**

هێری پەیکە ویسکییەکەی هەڵدا:

**ـ «مەهێڵـە ئـەم خۆشـییە بگۆڕێـت بـۆ شـانۆگەرییەکی سـووك و چـرووك.»**

**+ «بەڵـێ؟ باشـە دەتەوێـت بـۆ چـی بگۆڕێـت؟ کێوێـك لـە کا؟ دەتەوێـت هـەوڵ بـدەی گانەکـە تـەواو بکـەی یـا پێـت باشـترە بچیتـە حەمـام و بییـەی؟»**

هێری سـەیری نان دەکات:

**ـ «خوایـا نەفرەتـت لـێ بێـت، مەبـەرە زبـڵ. تـۆ لـە مـن باشـتر لـە بارودۆخەکـە تێدەگـەی. خـۆت حـەزت لـێ بـوو بێـی!»**

**+ «ئاخـر دەمزانی ئەگەر نەیـەم قاحپەیەك دەهێنی.»**

هێری گوتی:

- «ئاهـ گووهـ دووباره ئەم وشەیە.»

نان بە پەرداخەکەی نیشانەی لێ گرت و بەرەو دیوارەکەی هەڵدا:

+ «کامە وشە؟ کامە وشە؟»

هێری چوو تا پەرداخەکە هەڵگرێتەوە، پڕی کرد و دایەوە نان، پاشان بۆ خۆیشی تێی کردەوە.

نان سەیرێکی پەرداخەکەی کرد، قومێکی خواردەوە و لەسەر مێزەکەی دانا:

+ «تەلەفۆنی بۆ دەکەم و هەموو شتێکی پێ دەڵێم.»

- «گووت خوارد، ئەو ژنێکی نەخۆشە!»

+ «و تۆیش دایك قاحپەیەکی نەخۆشی!»

ڕێك هەر لەو کاتەدا دووبارە زرینگایەوە. تەلەفۆنەکە لە نێوەڕاستی ژوورەکە و هەر لەو شوێنەدا بوو کە هێری لەسەر زەوییەکەی جێی هێشتبوو.

هەردووکیـان لەسـەر تەختەکـەوە خۆیـان بـەرەو لای تەلەفۆنەکـە هەڵـدا. بـە جەڕەسـی دووەم هەردووکیـان خۆیـان هاویشـتە سـەر تەلەفۆنەکـە، هـەر کامەیـان لـە لایەکـەوە چنگیـان دە تەلەفۆنەکـە گیـر کـرد.

لەسـەر فەرشـەکە تێـك ئـاڵان و هەڵسـووڕان، بـە قورسـی هەناسـەیان دەکێشـا. دەسـت و پـێ و لاشـەیان لێکـڕا تێـك ئاڵابـوو و هـەر ئـەم دیمەنـە لـە ئاوێنـەی سەرتاسـەری بنمیچەکـەدا ڕەنگـی دەدایـەوە.

